| | | |
|---|---|---|
| هەرێمی کوردستان ـ عێراق<br>سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران<br>لیژنەی باڵای جێبەجێ کردنی یاسای چاکسازی | | إقليم كوردستان ـ العراق<br>رئاسة مجلس الوزراء<br>اللجنة العليا لتنفيذ قانون الإصلاح |

# ڕاپۆرتی جێبەجێکردنی یاسایی چاکسازی
# لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان - عێراق
# ژمارە ( ٢ )ی ساڵی ٢٠٢٠

# ڕاپۆرتی جێبەجێکردنی یاسایی چاکسازی
# لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە
# هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠

**پێشەکی:**

پرسی چاکسازی لە هەرێمی کوردستان یەکێکە لەو بابەتانەی کە وەك پێویستییەکی گرنگ سەیر دەکرێت، لەم ڕوانگەیەشەوە لە کارنامەی کابینەی نۆیەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەم پرسە لە ڕیزبەندی یەکەمی هێڵە گشتییەکاندا خراوەتەڕوو لەسەر بنەمای پابەندبوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە بەردەم هاووڵاتیان و پەرلەمانی کوردستاندا.

بۆ ئەمەش لەپێناو هێنانەدی دادپەروەری و یەکسانی لە نێوان سەرجەم سوودمەندان و مووچەخۆرانی هەرێمی کوردستان لە بوودجەی گشتی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ دەرچوو و لە ژمارە (٢٤٧)ی وەقایعی کوردستان لە ٢٠٢٠/٢/٦ بڵاوکرایەوە.

ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی ژمارە (٢٢) لە ٢٠٢٠/٢/١٢ بڕیاری پێکهێنانی لیژنەی باڵای بەدواداچوونی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی دەرکرد بە ژمارە (٤٧) لە ٢٠٢٠/٢/١٢ و، لە ماوەی دیاریکراوی یاسایی لە کۆبوونەوەی ئاسایی ئەنجومەن ژمارە (٢٤) لە ٢٠٢٠/٤/١ ڕەشنووسی پەیڕەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی پەسەندکرد و لە ژمارە (٢٤٩) لە ٢٠٢٠/٤/٧ **(هاوپێچی ژمارە ١)** لە وەقایعی کوردستان بڵاوکرایەوە.

لە ماوەی (٩٠) ڕۆژدا لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی ڕێکار و میکانیزمی پێویستی دانا لە دەرکردنی پەیڕەو و ڕێنمایی بۆ خستنەبواری جێبەجێکردنی یاساکە، کە لە ٢٠٢٠/٧/١ چووە بواری جێبەجێکردنەوە.

لەم ڕاپۆرتەدا وردەکاری سەرجەم هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی لە ماوەی سێ مانگی یەکەمدا دەخەینە ڕوو:

## بەشی یەکەم

## ئامانجەکان

**ماددەی (١):-** ئەم ماددەیە پەیوەیستە بە ئامانجەکان لە جێبەجێ کردنی ئەم یاسایە بەم شێوەیەی خوارەوە:

### برگەی دووەم:

بۆ بە دامەزراوەیی کردن و یەکخستنی بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانگە و یەکە جیاجیاکان کە مووچەی خانەنشینی تێدا خەرج دەکرێت لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی بە بڕیاری ژمارە (٢٩٣٣) لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٤/١٦ **(هاوپێچی ژمارە ٢)** وەزارەتی دارایی ڕاسپاردووە بە جێبەجێکردنی ئەم برگەیە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- وەزارەتی دارایی و ئابووری هەیکەلبەندیەکی نوێی لە چوارچێوەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی بۆ ئەم بەڕێوەبەرایەتییە نوێیە ئامادە کردووە.

٢- وەزارەتی دارایی و ئابووری لەبەر ڕۆشنایی یاسای خانەنشینی یەکگرتووی بەرکار پێشنیارەکانی بۆ دامەزراندنی سندوقی خانەنشینی ئامادە دەکات.

٣- **(**پەیڕەوی دامەزراندنی سندوقی خانەنشینی فەرمانبەرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٧) ی ساڵی ٢٠٢٠) پاش دەرچوونی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیران لە وەقایعی کوردستان بە ژمارە (٢٥٣) لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٨/١٦ بڵاوکرایەوە. **(هاوپێچی ژمارە ٣).**

### برگەی سێیەم:

وەزارەتی دارایی و ئابووری و بە هەماهەنگی لەگەڵ ئەنجومەنی وەزیران کاری لەسەر کاراکردن و پشتیوانی کردنی دارایی سندوقی خانەنشینی دەکات.

## بەشی دووەم

## ڕێکخستنەوەی ماف و ئیمتیازاتەکانی میراتگرانی کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان و زیندانیکراو و گیراوانی سیاسی

**ماددەی (٢):-** ئەم ماددەیە لە پێنج بڕگە پێکهاتووە بەم شێوەیە کاری لەسەر کراوە:

### بڕگەی یەکەم:

بەپێی ئەم بڕگەیە ڕەشنووسی پەیڕەوی (یەکخستنی ماف و ئیمتیازاتی کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان و زیندانی و گیراوی سیاسی لە هەرێمی کوردستان لەبەر ڕۆشنایی یاسا بەرکارەکان) ئامادەکراوە لەلایەن وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان بە نووسراوی ژمارە (٧٧) لە ٢٠٢٠/٩/٢٣ **(هاوپێچی ژمارە ٤)** ئاڕاستەی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران کراوە بۆ دەرچواندنی.

### بڕگەی دووەم:

١- بۆ پاککردنەوە و هەڵوەشاندنەوەی ماف و ئیمتیازاتی میراتگری ئەو کەسانەی کە بەدەر لە حوکمەکانی (یاسای ماف و ئیمتیازاتی کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان) ژمارە (٩) ی ساڵی ٢٠٠٧ی هەموارکراو سوودمەند بوون وەزارەتی شەهیدان بە فەرمانی ژمارە (٣١) لە ٢٠٢٠/٦/٢ ، **(هاوپێچی ژمارە ٥)** لیژنەیەکی پێکهێناوە و لیژنەکە لەکار بەردەوامن و ئەو فەرمان و بڕیار و ڕێکارانەی پێچەوانەی حوکمەکانی یاسای ئاماژە بۆکراو دەرچوون بە نووسراوی ژمارە (٧٦) لە ٢٠٢٠/٩/٢٣ **(هاوپێچی ژمارە ٦)**، ئاڕاستەی لیژنە باڵای جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کردووە بۆ کاری پێویست.

٢- وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوان بە مەبەستی جێبەجێکردنی بڕگەی دووەمی ئەم ماددەیە بە فەرمانی ژمارە (٤٣) لە ٢٠٢٠/٦/٣٠ **(هاوپێچی ژمارە ٧)** تۆماری زیندانی و گیراوی سیاسی نوێ لە وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوان هەڵپەسارد تاوەکو ئەرکی ووردبینی و پێداچوونەوە و پاککردنەوەی لیستەکان تەواو دەبێت.

### بڕگەی سێیەم:

١- وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان لیژنەیەکی تایبەتی پێکهێنا بە فەرمانیان ژمارە (٢٩) لە ٢٠٢٠/٦/٢ **(هاوپێچی ژمارە ٨)** بە سەرۆکایەتی نوێنەری ئەنجومەنی وەزیران و ئەندامێتی نوێنەرانی وەزارەتی دارایی و ئابووریی و وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان، و ئەرکی ووردبینی و پێداچوونەوەو پاککردنەوەی لیستەکانی زیندانی و ڕاگیراوی سیاسی بەپێی شایستەی یاسایی دیاریکراو دەگرنە ئەستۆ و لە کار بەردەوامن.

٢- وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالكراوان بە فەرمانی ژمارە (٤٥) لە ٢٠٢٠/٦/٣٠ **(هاوپێچی ژمارە ٩)** بەڕێوەبەرایەتی زیندانیانی سیاسی ڕاسپاردووە بۆ هەماهەنگی لەگەڵ لیژنەی باڵای بایۆمەتری و فەرمانگەی تەكنەلۆجیای زانیاری لە ئەنجومەنی وەزیران بۆ بە ئەلیكترۆنی كردنی تۆماری لیستەكانی زیندانی و ڕاگیراوی سیاسی بۆ ئەم مەبەستە هەماهەنگی پێویست كراوە لە نێوان فەرمانگەی تەكنەلۆجیای زانیاری و وەزارەتی كاروباری شەهیدان و ئەنفالكراوان و لە كار بەردەوامن.

٣- فەرمانگەی تەكنەلۆجیای زانیاری بە نووسراوی ژمارە (٢٢١) لە ٢٠١٩/١٢/٢٣ **(هاوپێچی ژمارە ١٠)** ئەنجامی تۆماری بایۆمەتری زیندانیانی سیاسی لە وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالكراوان (لیست و فایلی ٥٠٩١ تۆماركراو كە ٤٢٨٧ فایلی دوو مووچەیی لە خۆ دەگرێت) ڕادەستی وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالكراوان كردووە.

## بڕگەی چوارەم:

لەلایەن وەزارەتی دارایی و ئابووری ڕێنمایی ژمارە (١٩) لە ٢٠٢٠/٩/٢٨ **(هاوپێچی ژمارە ١١)** بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ میراتگری زیندانیكراو و گیراوی سیاسی بەپێی یاسای خانەنشینی بەركار دەرچوێنرا بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالكراوان و لایەنە پەیوەندیدارەكان جێبەجێ كراوە.

## بڕگەی پێنجەم:

١- لەلایەن وەزارەتی دارایی و ئابووری ڕێنمایی ژمارە (٢٠) لە ٢٠٢٠/٩/٢٨ **(هاوپێچی ژمارە ١٢)** بۆ خزمەتگوزاری تەندروستی و خوێندنی (كوڕ و كچ و هاوسەری شەهید كە هاوسەرگیری نەكردووەتەوە) دەرچوێنرا بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالكراوان و چۆتە بواری جێبەجێ كردنەوە.

٢- وەزارەتی كاروباری شەهیدان و ئەنفالكراوان بە فەرمانی ژمارە (٤٤) لە ٢٠٢٠/٦/٣٠ **(هاوپێچی ژمارە ١٣)** بەڕێوەبەرایەتی گشتی خزمەتگوزارییەكان و بانكی زانیاری لە دیوانی وەزارەت ڕاسپارد تاوەكو لەمەودوا بە شێوەیەكی بەردەوام زانیاری تەواو و باوەڕپێكراو لە بارەی كەس و كاری شەهیدان كە لەم بڕگەیە ئاماژەی پێدراوە بە پێی تەمەن و قۆناغی خوێندن ئامادە بكات تاوەكو لە نێوان وەزارەتە پەیوەندیدارەكان هەماهەنگی بكرێت و پلانی ساڵانەی پێویست بۆ ئەو خەرجییانە دابڕێژرێت و ئەم ڕێكارانە لە یەكەیەكی تایبەتمەند بەم بوارە لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ژمێركاری لە وەزارەتی دارایی و ئابووری ڕێكخراوە.

## بەشی سێیەم
## نەهێشتنی سوودمەندبوون لە جارێك زیاتر لە بودجەی گشتی

**ماددەی (٣):-** بەم شێوەیە بڕگەکانی ئەم ماددەیە جێبەجێکراوە:

### بڕگەی یەکەم:

١- لیژنە لاوەکییەکانی وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی بەردەوامن لە ووردبینی و پێداچوونەوە بە کەم و کوڕی لیستەکانی سوودمەندان لە تەرخانکراوی خاوەن پێداویستی تایبەت و کەم ئەندامان کە کۆی گشتی ژمارەیان **(٨٨٨٦٧)** کەم ئەندامە.

٢- وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی ڕێکخستنی مافی ئەوانەی پێویستیان بە چاودێری کۆمەڵایەتی هەیە، ڕەشنووسی پەیڕەوی (تۆڕی پاراستنی خێزان لەسەر بنەمای هەژاری) بە نووسراوی ژمارە (٤٢٥) لە ٢٠٢٠/٨/٢٦ **(هاوپێچی ژمارە ١٤)** ئاڕاستەی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران کردووە بە مەبەستی دەرچوواندن.

٣- ئامادەکردنی (پەیکەر و میلاکی گونجاو وسیستەم ورێنمایی) بۆ ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی لە لایەن وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی. بە نووسراوی ژمارە (٢٤٥) لە ٢٠٢٠/٦/١٥ **(هاوپێچی ژمارە ١٥)** و دیوانی ئەنجومەنی وەزیران بە نووسراوییان ژمارە (٥٤٢٥) لە ٢٠٢٠/٩/٢٩ **(هاوپێچی ژمارە ١٦)** ڕەزامەندیدا لەسەر کردنەوەی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی و دابین کردنی بینا و کەل و پەلی پێویست و پەسند کردنی سەرەتایی هەیکەلیەتی ناوەندی ئامادەپێکراو.

٤- لیژنەی باڵای جێبەجێ کردنی یاسای چاکسازی ڕەشنووسی بڕیاری دەرماڵەی لەبری پەککەوتەیی ئاڕاستەی ناوەندی یاسایی و ستراتیجی کردووە بە مەبەستی دەرچوواندنی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە.

### بڕگەی دووەم:

١- بۆ ڕێگری کردن لە سوودمەندبوونی زیاتر لە جارێك لە بوودجەی گشتی ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری ژمارە (٦٥) لە ٢٠٢٠/٧/٨ی **(هاوپێچی ژمارە ١٧)** دەرکرد ، کە بە فەرمانی ژمارە (٥٤٠٥) لە ٢٠٢٠/٩/٢٩ دەرچووەو لە خاڵی سێیەمی ئەم بڕیارە هاتووە کە شایستەبوونی کەسی تۆمارکراو بە داتابەیسی پرۆگرمی بایۆمەتری ملکەچە بۆ پێداچوونەوەو ووردبینی لەبەر ڕۆشنایی یاساو پەیڕەو و ڕێنمایی و بڕیارە پەیوەندیدارەکان.

٢- وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی دەستی بە هەماهەنگی کردووە لەگەڵ لیژنەی باڵای جێبەجێ کردنی قۆناغی دووەمی پرۆگرامی بایۆمەتری کە بە فەرمانی ژمارە (٤٦٤١) لە ٢٠٢٠/٨/١٢ **(هاوپێچی ژمارە ١٨)** پێکهاتووە.

### بڕگەی سێیەم:

١- لیژنەی باڵای بایومەتری بەپێی بڕیاری کۆبونەوەی ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠٢٠ لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٩/٧ و بەپێی فەرمانی ژمارە ٥٤٠٥ لە ٢٠٢٠/٩/٢٩ **(هاوپێچی ژمارە ١٩)** پێداچوونەوە دەکات بە لیستی ناوی (١٠٦٨٣٩) کەس کە زیاتر لە یەك منحە و ئیمتیازاتێك وەردەگرن.

٢- بەپێی ئەم بڕگەیە ئەو کەسانەی کە بڕگەی (دووەم)ی ئەم ماددەیە دەیانگرێتەوە، بەپێی یاسا و ڕێنماییەکان سەرەڕای مووچە سوودمەندن لە وەرگرتنی مینحە و ئیمتیازاتی دارایی تر لە بودجەی گشتی لە ناو هەرێم و دەسەڵاتی ئیتیحادی، سەرپشك دەکرێن بە وەرگرتنی تەنها یەکێك لەو مووچە و مینحە و ئیمتیازاتانە کە وەریدەگرن و لێی سوودمەندن.

### بڕگەی چوارەم:

جێبەجێ کردنی قۆناغی دووەمی سیستەمی بایۆمەتری لە میلاك و خانەنشینی ڕێگر دەبێت لە سوودمەند بوون زیاتر لە جارێك لە بوودجەی گشتی.

## بەشی چوارەم
## بواری پێشمەرگە و هێزەکانی ئاسایش و پۆلیسی ناوخۆ

**ماددەی (٤):-** بڕگەکانی ئەم ماددەیە بەم شێوەیە جێبەجێکراوە:

### بڕگەی یەکەم:

وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە بە فەرمانیان ژمارە (٧٩٥٩) لە ٢٠٢٠/٩/٢١ **(هاوپێچی ژمارە ٢٠)** بڕیاریدا بە یەکخستنی یەکەکانی ژمێریاری لە وەزارەت و هێزەکانی (٧٠) و (٨٠) لە یەك یەکەی ژمێریاری لە بەڕێوبەرایەتی گشتی بوودجە و بەرنامەکان/ ژمێریاری سەربازی و دەکەوێتە ژێر چاودێری فەرمانگەی چاودێری دارایی لە وەزارەتی پێشمەرگە و دیوانی چاودێری دارایی هەرێمی کوردستان.

## بڕگەی دووەم:

بەپێی فەرمانی ژمارە (٥٣٩٤/١٣) لە ٢٠٢٠/٦/٣٠ **(هاوپێچی ژمارە ٢١)** وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە دەسەڵاتی تەواوی داوە بە فەرمانگەی (چاودێری دارایی) کە یەکەکانی ژمێریاری لە ژێر ووردبینی دیوانی چاودێری دارایی هەرێمی کوردستان و (فەرمانگەی چاودێری دارایی) بن بۆ ئەم مەبەستە فەرمانگەی چاودێری دارایی و ووردبینی ناوەندی وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە بە شێوەی مانگانە و وەرزی و ساڵانە دەکات و چاودێری گشت کاروبارەکانی ژمێریاری و دارایی و کارگێری هێزەکانی پیشمەرگەی کوردستان ئەنجام دەدات و لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٧/١ مانگانە لیستی مووچەی هەردوو فەرماندەیی (٧٠) و(٨٠) دەدرێتە بەرێوەبەرایەتی گشتی بودجە و بەرنامەکان/ ژمێریاری سەربازی.

## بڕگەی سێیەم:

١- وەزیری کاروباری پێشمەرگە بە فەرمانی ژمارە (٥٣٩٤/١٣) لە ٢٠٢٠/٦/٣٠ **(هاوپێچی ژمارە ٢١)** دەسەڵاتی داوە بە فەرمانگەی چاودێری دارایی بۆ ووردبینی کردنی لیستی پێشمەرگە و دروستکردنی دۆسیەی کەسی بە پێداویستییە یاساییەکانەوە، و پێداچوونەوە بە خزمەتی پێشمەرگایەتی لە گشت یەکەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان ڕێکخراو و ڕێکنەخراو لە چوارچێوەی هەیکەلیەتی وەزارەتی (کاروباری پێشمەرگە) بە هەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی میلاکی سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی بوودجە لە وەزارەتی دارایی و ئابووری.

٢- وەزارەتی پێشمەرگە بە نووسراوی ژمارە (٨٠٦٠) لە ٢٠٢٠ /٩/٢٢ **(هاوپێچی ژمارە ٢٢)** پێشنیاری تایبەت بۆ دەرکردنی ڕێنمایی بە مەبەستی جێبەجێکردنی ماددەی (٦) بڕگەی یەکەم (ئەو بەشەی کە بواری سەربازی دەگرێتەوە) لە یاسای چاکسازی تایبەت بە پێداچوونەوە و ڕێکخستنەوەی پلە و ناونیشان و مووچەی وەزیفی لە بواری پێشمەرگایەتی ئاراستەی وەزارەتی دارایی وئابووری کردووە.

## بڕگەی چوارەم:

وەزارەتی ناوخۆ بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە و ئەنجومەنی ئاسایش بەردەوامن لە ئامادەکردنی ڕەشنووسی پەیڕەوی یەکەی پاسەوانی و خشتەی پاسەوانان تاوەکو دوای تەواوکردنی ئاڕاستەی ئەنجومەنی وەزیرانی بکەن بۆ دەرچواندنی پەیڕەوەکە و پەسەندکردنی.

### بڕگەی پێنجەم:

بڕگەی پێنجەم لە یاسای چاکسازی تایبەتە بە گواستنەوەی گشت پاسەوانەکان بۆ سەر میلاکی هێزەکانی یەکەی پاسەوانی لە وەزارەتی ناوخۆ و بە هیچ جۆرێك نابێت پاسەوان لەسەر میلاکی هیچ یەکەیەکی تری سەربازی یان هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ هەبێت جگە لە یەکەی پاسەوانی سەر بە وەزارەتی ناوخۆ، و خەرجکردنی مووچەی پاسەوانی تەنها لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ژمێریاری وەزارەتی ناوخۆ دەبێت دوای هاوتاکردن و یەکخستنیان ئەم پرۆسیە دوای دەرچوواندنی پەیڕەوی یەکەی پاسەوانی دەچێتە بواری جێبەجێکردن.

### بڕگەی شەشەم:

١- بۆ جێبەجێکردنی ئەم بڕگەیە دیوانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بە فەرمانی دیوانی ژمارە (٥٢٣٩) لە ٢٠٢٠/٩/٢٢ لیژنەیەکی پێکهێناوە **(هاوپێچی ژمارە ٢٣)** بۆ پرۆسەی پێداچوونەوە و ڕێکخستنەوەی لیستی سوودمەندانی خانەنشینی کەمئەندامانی پێشمەرگە لەبەر ڕۆشنایی یاسای ژمارە (٣٤)ی ساڵی ٢٠٠٧ یاسای خانەنشینی کەمئەندامانی پێشمەرگە(زێڕەڤانی) هەرێمی کوردستان - عێراق.

٢- وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە بە فەرمانی وەزاری و نوسراوی ژمارە (٦٧٠٣) لە ٢٠٢٠/٨/٢٥ **(هاوپێچی ژمارە ٢٤)** کە بریتییە لە لیستی ناوی (١٠٤٧) شەهیدی شەڕی داعش دۆسیەکانی (شەهیدان و کۆچکردووان)ی ناردووە بۆ وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان بۆ گواستنەوەی مووچەکانیان بۆ سەر وەزارەتی ناوبراو بە مەبەستی ڕێکخستن و یەکخستنی لیستی شەهیدان.

## بەشی پێنجەم

## دەرماڵەکان

**ماددەی (٥):-** ئەم ماددەیە بەم شێوەیە جێبەجێ کراوە:

١- وەزارەتی دارایی و ئابووری لیستی دەرماڵەکانی ئامادە کردووە و بە نوسراویان ژمارە (٢٦٠) لە ٢٠٢٠/٦/١١ **(هاوپێچی ژمارە ٢٥)** بۆ لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی بەرزکراوەتەوە هەروەها بە راوێژ لەگەڵ وەزارەتەکان و ڕای بەڕێوەبەرایەتی ژمێریاری وەزارەتەکان و فەرمانگە جیاوازەکانی دەربارەی جۆر و بڕی دەرماڵەکان وەرگرتووە بە نووسراویان ژمارە (٢٧٦) لە ٢٠٢٠/٦/٢٨ **(هاوپێچی ژمارە ٢٦)** بۆ ئەنجومەنی وەزیران بەرزکراوەتەوە.

٢- ناوەندی ڕاوێژی یاسایی و ستراتیژی لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دوای دیراسەت کردنی لیستی دەرماڵەکان ڕەشنووسی بڕیارێکی ئامادە کردووە بۆ ئەوەی لە ئەنجومەنی وەزیران پەسند بکرێت.

٣- فەرمانگەی تەکنەلۆجیای زانیاری دەرماڵەکان پۆلێن کردووە کە گشت دەرماڵەکان لەسەر ئاستی وەزارەت و دەستە و فەرمانگە نەبەستراوەکان لە خۆ دەگرێت و بە نووسراوی ژمارە (٣) لە ٢٠٢٠/٧/١ **(هاوپێچی ژمارە ٢٧)** ڕاپۆرتێکیان لەسەر گشت دەرماڵەکان بۆ لیژنەی باڵای جێبەجێ کردنی یاسای چاکسازی بەرز کردۆتەوە.

٤- ناوەندی راوێژی یاسایی لە ئەنجومەنی وەزیران ڕەشنووسی بڕیاری ڕێکخستنەوە و پێداچوونەوە بە گشت دەرماڵەکانی ئامادە کردووە بۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران بە مەبەستی پەسندکردنی لەسەر ڕاسپاردەی لیژنەی باڵای جێبەجێ کردنی یاسای چاکسازی کە لە کۆبوونەوەی ژمارە (١) بە بڕیاری ژمارە (٢٩٤٠) لە ٢٠٢٠/٤/١٦ **(هاوپێچی ژمارە ٢٨)** بۆ ئەم مەبەستە ڕاسپێردراوە.

## بەشی شەشەم
## ڕێکخستنەوەی هەژمارکردنی خزمەت

**ماددەی (٦):-** بڕگەکانی ئەم ماددەیە بەم شێوەیە جێبەجێ کراوە:

وەزارەتی دارایی وئابووری بۆ جێبەجێکردنی گشت بڕگەکانی ئەم ماددەیە و پێداچوونەوە و ڕێکخستنەوەی پلە و ناونیشان و مووچەی وەزیفی سەرجەم مووچەخۆرانی هەرێم لە بوارەکانی خزمەتی (شارستانی، پێشمەرگایەتی، هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ) بەپێی یاسا و پەیڕەو و ڕێنماییە کارپێکراوەکان، بە نووسراوی ژمارە (٤٢٢٦) لە ٢٠٢٠/٦/٢٩ **(هاوپێچی ژمارە ٢٩)** ڕێنمایی دارایی ژمارە (١٢)ی دەرچوواند و لە ژمارە (٢٥٢)ی وەقایعی کوردستان لە ٢٠٢٠/٧/٢٢ بڵاوکرایەوەو لە ئێستادا کاری لەسەر دەکرێت بەپێی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:

١- پاش جێبەجێکردنی ڕێنمایی سەرەوە لەلایەن وەزارەتەکان و دەستەکان ئەنجومەنی وەزیران ئەرکی هەڵوەشاندنەوەی گشت ئەو ئەو بڕیارانە دەگرێتە ئەستۆ کە پەیوەستن بە ئەژمار کردنی خزمەتی فەرمانبەری بەدەر لە یاسا و ڕێنماییە کارپێکراوەکان.

٢- وەزارەتی دارایی و ئابووری بۆ پێداچوونەوەو ڕێکخستنەوەی خزمەتی پێشمەرگایەتی و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ بە هەماهەنگی وەزارەتەکانی ناوخۆ و پێشمەرگە ڕێنمایی پێویست دەردەکات کە وەزارەتی پێشمەرگە بە نووسراویان ژمارە (٨٠٦٠) لە ٢٠٢٠/٩/٢٢ **(هاوپێچی ژمارە ٢٢)** ڕەشنووسی ڕێنماییان ئاراستەی وەزارەتی دارایی و ئابووری کردووە.

٣- گشت وەزارەت و لایەنی نەبەستراو بە وەزارەت دەستیان بە پێداچوونەوە بە دۆسیەی فەرمانبەران کردووە و تا ئێستا (**٢٠٨٩٤٤**) دۆسیەی فەرمانبەران ووردبینیان بۆ کراوە.

٤- هەماهەنگی نێوان سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتی دارایی و ئابووری کراوە سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی ڕێنمایی ژمارە (١٢) بۆ گشت لیژنە لاوەکییەکان .

٥- هەماهەنگی نێوان ئەنجومەنی وەزیران و دیوانی چاودێری دارایی و دەستەی دستپاکی و داواکاری گشتی کراوە سەبارەت بە هاوکاری کردنی دام و دەزگا و وەزارەتەکان بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕێنماییانە.

٦- لە کۆبونەوەی یەکەمی لیژنەی باڵای بایۆمەتری لە ٢٠٢٠/٩/٧ بڕیاردرا بەوەی کە قۆناغی دووەمی بایۆمەتری هاوتەریب و یارمەتیدەر بێت بۆ پێداچوونەوە بە میلاکاتی فەرمانبەران، و بەستنەوەی بە سیستەمی بایۆمەتری وە جێبەجێکردنی ماددەی (٦) لە یاسای چاکسازی بۆ دووبارە هەژمارکردنەوەی خزمەت بۆ ئەوەی بە یەك سیستەم جێبەجێ بکرێت، و هیچ جیاوازییەك لە جێبەجێکردنی نەبێت لە نێوان وەزارەت و دەستەو لایەنە نەبەستراوەکان بە وەزارەت.

## بەشی حەوتەم
## بواری خانەشینی

**ماددەکانی (٧):-**

١- بۆ جێبەجێکردنی ئەم ماددەیە لە یاسای چاکسازی وەزارەتی دارایی و ئابووری بە نووسراوی ژمارە (٤٢٣٠) لە ٢٠٢٠/٦/٢٩ ڕێنمایی دارایی ژمارە (١٣) ی دەرچوواند کە بە ژمارە (٢٥٢) لە ٢٠٢٠/٧/٢٢ لە وەقایعی کوردستان بلاوکرایەوە کە ڕێنماییەکی گشتگیرە بۆ پرسی خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان (**هاوپێچی ژمارە ٣٠**).

٢- لە ١ی تەمووزی ٢٠٢٠ ەوە هەموو مامەڵەیەکی خانەنشینی بەپێی ڕێنمایی ژمارە ١٣ و یاسای چاکسازی کراوە.

٣- هەموو ئەوانەی بەپێی یاسای خانەنشینی پلە باڵاکان ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٤ خانەنشین کرابوون وەك ناونیشانی (شارەزا) لە ئێستادا پێداچوونەوەیان بۆ کراوە کە ژمارەیان (٤٥٨) کەسە و لە چوارچێوەی یاسای ژمارە (٢٧)ی ساڵی ٢٠٠٦ی خانەنشینی یەکگرتووی هەموارکراو ڕاستکردنەوەی مووچەیان بۆ کراوە.

**ماددەی (٨):-**

١- دیوانی ئەنجومەنی وەزیران بە فەرمانی دیوانی ژمارە ٥٢٣٩ لە ٢٠٢٠/٩/٢٢ **(هاوپێچی ژمارە ٢٣)** لیژنەیەکی پێکهێنا بۆ گواستنەوەی لیستی خانەشین و کەم ئەندام و پەککەوتەی سەنگەر لە وەزارەتی پێشمەرگەوە بۆ وەزارەتی دارایی و ئابووری/ بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی و هەڵوەشاندنەوەی گشت یەکەکانی خانەنشینی لە وەزارەتی پێشمەرگە.

٢- وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە پاش ئەنجامدانی چەند کۆبوونەوەیەکی هاوبەش لەگەڵ وەزارەتی دارایی و ئابووری بە نووسراوی ژمارە (٧٤٠٣) ٢٠٢٠/٩/٨ **(هاوپێچی ژمارە ٣١)** داوای لە هەردوو یەکەی (٧٠) و (٨٠) کردووە دۆسیەکانی (شەهیدان، کۆچکردوان، خانەنشینان بە گشت جۆرەکانی) بگاتە وەزارەتی پێشمەرگە بە مەبەستی گواستنەوەیان بۆ وەزارەتی دارایی و ئابووری/ بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی.

٣- بەپێی نووسراوی وەزارەتی پێشمەرگە ژمارە (٧٤٠٣) ٢٠٢٠/٩/٨ **(هاوپێچی ژمارە ٣١)** داوا لە هەردوو یەکەی (٧٠) و (٨٠) کراوە گشت دۆسیەکانی (پەککەوتەی سەنگەر) بگاتە وەزارەتی پێشمەرگە بە مەبەستی گواستنەوەی بۆ وەزارەتی دارایی و ئابووری/ بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی.

یەکەی ٨٠ی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان بە نووسراویان ژمارە ٣٦٩٩ لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/١٠/١١ وەڵامی وەزارەتی پێشمەرگەی داوەتەوە کە ئامادەن سەرجەم دۆسیە و لیستی مووچەخۆران و ئەفسەران و پلەداران و خانەنشینی بە هەمووجۆرەکان و شەهیدان و کۆچکردووان و کەم ئەندامان بەپێی یاسای چاکسازی بۆ وەزارەتی پێشمەرگە بنێرن. **(هاوپێچی ژمارە ).**

**ماددەی (٩):-**

ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی ژمارە (٤١) لە ٢٠٢٠/١٠/٧ بڕیاریدا لەسەر پێداچوونەوە بە خانەنشینی پلە باڵاکان جیاکردنەوەی لیستی ئەو پێشمەرگانەی کە لە ڕیزی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بوون پێش ڕێکەوتی ١٩٩١/٣/٥ بە پلەی (وەزیر و بریکاری وەزارەت و ڕاوێژکار و بەڕێوەبەری گشتی) و هەر پلەیەکی تری تایبەت خانەنشین کراون و ڕەشنووسی بڕیار بۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران ئامادەکراوە بۆ ئەوەی ئەنجومەنی وەزیران وەزارەتی دارایی و ئابووری ڕاسپێرێت بە گرتنەبەری ڕێکاری یاسایی پێویست لەبەر ڕۆشنایی یاسای ژمارە (٣٣)ی ساڵی ٢٠٠٧یاسای (ڕێزلێنانی پێشمەرگە (زێڕەڤانی) هەرێمی کوردستان- عێراق)، یان یاسای ژمارە (٣٤)ی ساڵی ٢٠٠٧یاسای (خانەنشینی کەمئەندامانی پێشمەرگە (زێڕەڤانی) هەرێمی کوردستان . عێراق)، یان یاسای ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٧یاسای (ڕاژە و خانەنشینی پێشمەرگە (زێڕەڤانی) هەرێمی کوردستان - عێراق) بەپێی تایبەتمەندی ئیمتیازێکی دارایی شایستەیان بۆ دابین بکرێت.

**ماددەی (١٠):-**

١- بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی لە گشت بەڕێوەبەرایەتییەکان لیژنە لاوەکی پێکهێناوە بۆ پێداچوونەوەی دۆسیەی گشت خانەنشین کراوەکان بە مەبەستی جیاکردنەوەی خانەنشینانی شایستە و ناشایستە.

٢- بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشین بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی پلاندانان و ڕێکخراوی UNDP و فەرمانگەی تەکنۆلۆجیای زانیاری سیستەمێکی ئەلیکترۆنی داناوە بەمەبەستی دروستکردنی دۆسییەی ئەلیکترۆنی بۆ گشت خانەنشینکراوان ئەم پرۆسەیە یارمەتیدەر دەبێ بۆ لێك جیاکردنەوەی کەسانی شایستە و ناشایستە و یەکخستنەوەی مافەکانیان.

٣- لیژنەی باڵای بایۆمەتری لە ڕێگای فەرمانگەی تەکنۆلۆجیای زانیاری لە قۆناغی دووەمی بایۆمەتری سیستەمی خانەنشینی بە سیستەمی بایۆمەتری دەبەستێتەوە.

## بەشی هەشتەم
## حوکمەکانی کۆتایی

**ماددەی (١١):-** بڕگەکانی ئەم ماددەیە بەم شێوەیە جێبەجێ کراوە:

### بڕگەی یەکەم:

حوکمەکانی ئەم یاسایە لەدوای دەرچوونی پەیڕەوی ئاسانکاری جێبەجێ کردنی یاسای چاکسازی ژمارە (٤)ی ساڵی ٢٠٢٠ کە لە ژمارە (٢٤٩) وەقایعی کوردستان **(هاوپێچی ژمارە ١)**، چووەتە بواری جێبەجێ کردنەوە.

### بڕگەی دووەم:

دیوانی چاودێری دارایی لە هەرێمی کوردستان بە مەبەستی چاودێری جێبەجێکردنی ئەم یاسایە بەپێی فەرمانی دیوانی ژمارە (١٧٣/١/١) لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٨/١١ چەند لیژنەیەکی پێکهێناوە، **(هاوپێچی ژمارە ٣٢)**.

### بڕگەی سێیەم:

١- هەر سێ لایەنی دیوانی چاودێری دارایی لە هەرێمی کوردستان و دەستەی دەسپاکی لە هەرێمی کوردستان و سەرۆکایەتی داواکاری گشتی ئامادەکارییان کردووە بۆ ئەو ئەرکانەی کە لە یاساکە پێیان سپێراوە.

٢- دەستەی دەسپاکی لە هەرێمی کوردستان بە فەرمانیان ژمارە (١٥/٢) لە ٢٠٢٠/٦/١٤ **(هاوپێچی ژمارە ٣٣)** تیمەکانی کارکردنیان پێکهێناوە بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان بەپێی ناوەڕۆکی حوکمەکانی یاسای چاکسازی.

**ماددەی (١٢):-** بڕگەکانی ئەم ماددەیە بەم شێوەیە جێبەجێ کراوە:

### بڕگەی یەکەم:

دامەزراندن لە وەزیفەکانی (بەڕێوەبەری گشتی و راوێژکار و سەرووتر) لە دامەزراوە دەستوورییەکانی هەرێمی کوردستان . عێراق رادەگیرێت مەگەر تەنها لەو کاتەی پلەی بەتاڵ هەبێت بەپێی پەیڕەوی ژمارە (٦) ی ساڵی ٢٠٢٠ کە لە ژمارە (٢٥٣) لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٨/١٦ کە لە وەقایعی کوردستان بڵاوکراوەتەوە **(هاوپێچی ژمارە ٣٤)** بۆ دیاری کردنی مەرجەکانی دامەزراندن لە پلە باڵاکان لە هەرێمی کوردستان ئەم بابەتە ڕێکخراوە.

### بڕگەی دووەم:

بۆ چارەسەر کردنی بابەتی پلە معومەکان و بە مەبەستی خانەنشینکردنی ئەو فەرمانبەرانەی بە پلەی (بەڕێوەبەری گشتی و سەرووتر) کە پێکهاتەی ئیداری لە ئاستی (بەڕێوەبەرایەتی گشتی و سەرووتر) بەڕێوەنابەن سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ سەرۆکایەتی دیوان بە نووسراویان ژمارە (٣٣٦٢) لە ٢٠٢٠/٦/٣ **(هاوپێچی ژمارە ٣٥)** گشتاندنیان ئاڕاستەی گشت وەزارەتەکان دام و دەزگاکانی نەبەستراو بە وەزارەت کردووە و داتای گشت بەڕێوەبەری گشتی و پلەباڵا و پارێزگار و قایمقام و بەڕێوەبەری ناحیەی معەوەمی لە سەرجەم وەزارەتەکان وەرگرتووە و رەشنووسی بڕیارێك ئامادەکراوە بۆ گونجاندنیان لەگەڵ یاسای چاکسازی.

### بڕگەی سێیەم:

جێبەجی کردنی حوکمەکانی ئەم ماددەیە سەرۆکی یەکە ئیدارەکانیش (پارێزگار، قایمقام، بەڕێوەبەری ناحیە) دەگرێتەوە کە هیچ یەکەیەکی ئیداری بەڕێوە نابەن.

### بڕگەی چوارەم:

ئەنجومەنی وەزیران پەیڕەوی ژمارە (٦) ی ساڵی ٢٠٢٠ مەرجەکانی دامەزراندن بە پلەی (بەڕێوەبەری گشتی و بەرەوژوور) پەسەند کرد و لە ژمارە (٢٥٣) لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٨/١٦ لە وەقایعی کوردستان بڵاو کراوەتەوە. **(هاوپێچی ژمارە ١)**.

**ماددەی (١٣):-** بڕگەکانی ئەم ماددەیە بەم شێوەیە جێبەجێ کراوە:

## بڕگەی یەکەم:

بۆ کردنەوەی ئەژمێرەی بانکی بۆ سەرجەم فەرمانبەران و مووچەخۆرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان وەزارەتی دارایی و ئابووری گشتاندنی کردووە بە ژمارە (٢٦٨) لە ٢٠٢٠/٦/١٧ بۆ سەرجەم وەزارەت و لایەنە نەبەستراوەکان بە وەزارەت و تاکو ئێستا ژمارەی (٦٨٥٠٧) فەرمانبەر و مووچەخۆر ئەژمێری بانکیان بۆ کراوەتەوە و پرۆسەکە بەردەوامە. **(هاوپێچی ژمارە ٣٦).**

## بڕگەی دووەم:

لیژنەی یاسایی ئەنجومەنی وەزیران کار دەکەن لەسەر ئامادە کردنی پرۆژە یاسای خانەنشینی یەکگرتوو لە هەرێمی کوردستان کە تیایدا ڕەچاوی کەمترین مووچەی خانەنشینی دەکرێت بەپێی بارودۆخی دارایی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

## بڕگەی سێیەم:

**قەرزە بازرگانییەکان:**

١- بۆ وەرگرتنەوەی قەرزە بازرگانییەکان وەزارەتی دارایی و ئابووری تاپۆی سەرجەم ماڵ و موڵکی ڕەهنکراوی ئاڕاستەی فەرمانگەی جێبەجێکردن لە وەزارەتی داد کردووە بە مەبەستی فرۆشتنەوەی موڵکەکانیان بە پێی یاسای (وەرگرتنەوەی قەرزە حکومییەکان) ژمارە (٥٦)ی ساڵی ١٩٧٧.

٢- کۆی گشتی قەرزە حکومییەکان لە هەرسێ پارێزگای (هەولێر و دهۆک و سلێمانی) بڕی (٩٢٨،٧٦٣،٨١٢،١٦٥) نۆ سەد و بیست و هەشت ملیار و حەوت سەد و شەست و سێ ملیۆن و هەشت سەد و دوانزە هەزار و سەد و شەست و پێنج دینارە، و لەم بڕەیە تەنها (١،١٠٠،٥٠٠،٠٠٠) یەك ملیار و سەد ملیۆن و پێنج سەد هەزار دینار لە ڕێگەی بانکە بازرگانییەکان وەرگیراوەتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٧/١ تاکو ٢٠٢٠/٩/٣٠:-

- بانکی گۆیژە (٥٦٠٠٠٠٠٠٠) ملیۆن دینار.
- بانکی کۆیە (٧٣٠٠٠٠٠) ملیۆن دینار.
- بانکی سلێمانی/١ (١٩٥٠٠٠٠٠٠) ملیۆن دینار.
- بانکی عەنکاوە (١٥٣٠٠٠٠٠٠) ملیۆن دینار.
- بانکی زاگرۆس (٨٢٨٠٠٠٠٠) ملیۆن دینار.
- بانکی نیشتمان (٣٦٧٠٠٠٠٠) ملیۆن دینار.

٣- وەزارەتی داد فەرمانگەی جێبەجێکردنی دادی نوێی لە پارێزگای هەولێر دامەزراندووە تایبەت بە وەرگرتنەوەی قەرزە حکومییەکان کە بە بەیانی ژمارە (١) ساڵی ٢٠٢٠.

**ماددەی (١٤):-** بڕگەکانی ئەم ماددەیە بەم شێوەیە جێبەجێ کراوە:

### بڕگەی یەکەم:

جێبەجێکردنی حوکمەکانی ئەم یاسایە ئاسەواری دارایی و دادوەری لێناکەوێتەوە بۆ حاڵەتەکانی پێش کەوتنەبواری جێبەجێکردنی یاساکە لەسەر ئەو کەسانەی کە دەیانگرێتەوە.

### بڕگەی دووەم:

ئەوانەی حوکمەکانی ئەم یاسایە دەیانگرێتەوە مافی ئەوەیان هەیە بەپێی حوکمەکانی یاسای بەرکار تانەی یاسایی بدەن.

**ماددەی (١٥):-**

لیژنەی باڵای جێبەجێ کردنی قۆناغی دووەمی بایۆمەتری کە بە بڕیاری ژمارە (٦٥) لە ٢٠٢٠/٧/٧ی **(هاوپێچی ژمارە ١٧)** ئەنجومەنی وەزیران پێکهاتووە و، بە فەرمانی ژمارە (٥٤٠٥) لە ٢٠٢٠/٩/٢٩ دەرچووەو لە خاڵی یەکەمی ئەم بڕیارە هاتووە و وەزارەتی دارایی و ئابووری و فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون و فەرمانگەی تەکنەلۆجیای زانیاری ڕاسپاردووە بە ئامادە کردنی ڕاپۆرتێکی وورد و پێشکەش کردنی بە لیژنەی باڵای جێبەجێ کردنی قۆناغی دووەمی بایۆمەتری لەبەر ڕۆشنایی ئەحکامەکانی بەشی سێیەم لە یاسای چاکسازی ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ بە مەبەستی ڕاگرتنی سوودمەند بوونی ئەوانەی بە ناشایستە زیاتر لە جارێك سوودمەندن لە بوودجەی گشتی.

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
ژمارەی : ٤٤٩١ لە ٢٠٢٠/٧/٢٩

هاوپێچی ژمارە ١

## بڕیار
## ژمارە (٦٩)ی ساڵی ٢٠٢٠

پشتبەست بە ئەحکامی ماددەی (هەشتەم) لە یاسای ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەمواركراو ، و لەبەر رۆشنایی بڕگەی (سێیەم) لە ماددەی (١) و لەماددەی (٨) لە یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠، و پشتبەست بە حوکمی ماددەی (١٨) لە یاسای خانەنشینی یەکگرتوو ژمارە (٢٧)ی ساڵی ٢٠٠٦ی هەمواركراو ، و لەسەر پێشنیاری وەزارەتی دارایی و ئابووری ، و لەبەر ڕۆشنایی کۆنووسی کۆبوونەوەی ئاسایی ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (٣٤) لە ڕێکەوتی ١٥/ ٧ / ٢٠٢٠، ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری دا بە :

١- پەسەندکردنی (پەیڕەوی ناوخۆیی بۆ سندوقی خانەنشینی فەرمانبەرانی هەرێمی کوردستان ).
٢- سەرجەم وەزارەت و لایەنە پەیوەندیدارەکان ئەم بڕیارە جێبەجێ دەکەن .

**مەسرور بارزانی**
**سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران**

**سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران**

**ژمارەی : ٤٤٩٥ لە ٢٠٢٠/٧/٢٩**

پشتبەست بە حوکمی بڕگەی (چوارەم) لە ماددەی (١٢) لە یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠، و بڕگەی (٣) لە ماددەی (هەشتەم) لە یاسای ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەمواركراو، ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی ژمارە (٣٤) لە ڕێکەوتی ١٥/ ٧ / ٢٠٢٠، ئەم پەیڕەوەی دەرکرد:

## پەیڕەوی ژمارە (٦)ی ساڵی ٢٠٢٠
## پەیڕەوی دیاریکردنی مەرجەکانی دامەزراندن لە پلەی باڵا
## لە هەرێمی کوردستان - عێراق

**ماددەی (١):**

**یەکەم:** ئەو کەسەی دادەمەزرێت لە پلەی باڵا (أ) یان (ب)ی خشتەی پەیڕەوکراوی مووچە لە هەرێمی کوردستان - عێراق، یان بەو پلانە دادەمەزرێت، یان مووچە و دەرماڵەی ئەو پلانەی بۆ خەرج دەکرێت، سەرباری هەبوونی مەرجە گشتییەکانی دامەزراندن لە وەزیفەی گشتییدا، پێویستە ئەم مەرجانەی خوارەوەی لێ بێتە دی:

أ- هەبوونی پلەی وەزیفی چۆڵ لە میلاك بۆ دامەزراندن.

ب- بەلانی کەم هەڵگری بڕوانامەی زانکۆیی بەرایی بێت، شارەزایی و لێهاتوویی لە بواری پسپۆڕیی ئەو وەزیفەیەی لێی دادەمەزرێت هەبێت، و بۆ ئەم مەبەستەش بەڵگەنامەی ڕاستێندراوی پێویست بۆ سەلماندنی هاتنەدی ئەم مەرجە پێشکەش بە لایەنی پەیوەندیدار بکات.

ج- بە تاوانی ئابڕووبەر یان جینایەت حوکم نەدرابێت و لە ماوەی خزمەتکردنیدا دەستپاکیی و لێهاتوویی سەلمێندرابێت.

د- بەشداری لەو تاوانانە نەکردبێت کە ڕژێمی بەعس نەخشەی بۆ کێشا بێت یان ئەنجامی دابێت لە عێراقدا.

**دووەم:** بۆ دامەزراندن لە وەزیفەی بەڕێوەبەری گشتی و ئەوانەی بەو پلەیەن و ئەوانەشی کە مووچە و دەرماڵەی ئەو پلەیە وەردەگرن، لە دوای بەدەستهێنانی بڕوانامەی ئاماژەپێکراو دەبێت خزمەتی لە (١٠ دە ساڵ ) کەمتر نەبێت، و (٢) دوو ساڵ لەو ماوەیە کەمدەکرێتەوە بۆ ئەوانەی بڕوانامەی ماستەر یان هاوتاکەیان بەدەستهێناوە، و (٤) چوار ساڵیش بۆ ئەوانەی بڕوانامەی دکتۆرا یان هاوتاکەیان بەدەستهێناوە، و کەمترین ماوەی خوێندن بۆ وەرگرتنی هەریەك لەو دوو بڕوانامەیە بە ماوەی ڕاژە دادەنرێت بۆ مەبەستەکانی ئەم پەیڕەوە.

**ماددەی (٢):**

**یەکەم:** خاوەن پلە باڵا بە فەرمانی هەرێمیی دادەمەزرێت دوای پاڵاوتنی لەلایەن سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان - عێراق-ەوە یان هەر لایەنێکی تایبەتمەندی دیکە بەپێی حوکمەکانی یاسا بەرکارەکان.

**دووەم:** دامەزراندن لە وەزیفەکانی بەڕێوەبەری گشتی و سەروتر لە دامەزراوە دەستوورییەکانی هەرێم ڕادەگیرێت مەگەر تەنها لەو کاتەی پلەی چۆڵ هەبێت.

**ماددەی (٣):**

حوکمەکانی ئەم پەیڕەوە پیادە ناکرێت لەسەر ئەمانەی خوارەوە:

أ- سەبارەت بەو خاوەن پلە باڵایانەی کە ڕێکار و مەرجەکانی دامەزراندنیان لە یاسا بەرکارە تایبەتەکان لە هەرێمی کوردستان - عێراق دیاری کراون.

ب- ئەوانەی ڕاسپێردراون بە خزمەتی گشتی کە لە ڕێنمایی ئاسانکاریی جێبەجێکردنی ئەم پەیڕەوە لەلایەن وەزارەتی دارایی و ئابووری-یەوە دەستنیشان دەکرێن بۆ مەبەستەکانی ئەم پەیڕەوە.

**ماددەی (٤):**

پێویستە ئەنجومەنی وەزیران و لایەنە پەیوەندیدارەکان حوکمەکانی ئەم پەیڕەوە جێبەجێ بکەن.

**ماددەی (٥):**

وەزارەتی دارایی و ئابووری ڕێنمایی پێویست بۆ ئاسانکاریی جێبەجێکردنی ئەم پەیڕەوە دەردەکات.

**ماددەی (٦):**

ئەم پەیڕەوە لە دوای تێپەڕبوونی (٣٠) سی ڕۆژ لە ڕێکەوتی بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی فەرمی (وەقایعی کوردستان) دەکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

**مەسرور بارزانی**
**سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران**

**هۆکارەکانی دەرچوواندنی ئەم پەیڕەوە**

بە مەبەستی دیاریکردنی مەرجەکانی دامەزراندنی پلە باڵاکان لە هەرێمی کوردستان - عێراق، سەرباری بوونی مەرجە گشتییەکانی دامەزراندن لە وەزیفەی گشتییدا، بە ڕەچاوکردنی بڕوانامە و پسپۆڕی و ساڵانی خزمەت و شارەزایی و لێهاتوویی، ئەم پەیڕەوە دەرچووێندرا

هەرێمی کوردستان - عێراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
لیژنەی باڵای جێبەجێ کردنی یاسای چاکسازی

إقليم كوردستان - العراق
رئاسة مجلس الوزراء
اللجنة العليا لتنفيذ قانون الإصلاح

ژمارە: ٩٣٣
ڕێکەوت: ٧ / ٢ / ٢٠٢٠ ی نەورۆز ٢٧ ی کوردی

No:
Date: ٢٦ / ٤ / ٢٠٢٠

هاوپێچی ژمارە ٢

## بڕیار

**لەبەرڕۆشنایی کۆنووسی کۆبوونەوەی ژمارە(١)ی لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی لە ٢٠٢٠/٤/٨ و ئاماژە بە پەیڕەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی ژمارە(٤) ماددەی ٢٢/ بڕگەی دووەم ساڵی ٢٠٢٠ وبە پشتبەستن بە یاسای ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ یاسای چاکسازی لە مووچە ودەرماڵە وبەخشین وئیمتیازات وخانەنشینی لە هەرێمی کوردستان-عێراق، بڕیاردرا بە:**

**یەکەم:** وەزارەتی دارایی و ئابووری بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە هەیکەلبەندییەکی تازە بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی دادەمەزرێنێت بە مەبەستی گواستنەوەی گشت دۆسیەی خانەنشینانی ئەو بەڕێوەبەرایەتی گشتی و بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانگە و هەر یەکەیەکی دیکەی کارگێڕی و دارایی کە مووچەی خانەنشینییان لێ خەرج دەکرێت (شارستانی، سەربازی، هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ، یەکە ڕێکنەخراوەکانی هێزەکانی پێشمەرگە) بۆ سەر ئەو بەڕێوەبەرایەتیە.

**دووەم:** وەزارەتی دارایی و ئابووری پێشنیارەکانی بۆ دامەزراندنی سندوقی خانەنشینی ئامادە بکات لەبەر ڕۆشنایی یاسای خانەنشینی یەکگرتووی بەرکار.

**سێیەم:** بۆ مەبەستەکانی خاڵی یەکەم و دووەمی سەرەوە وەزارەتی دارایی و ئابووری ڕەشنووسی پەیڕەوێك ئامادە دەکات و بۆ ئەنجومەنی وەزیران بەرز دەکرێتەوە بە مەبەستی پەسەندکردنی.

**چوارەم:** وەزارەت و لایەنە پەیوەندیدارەکان ئەم بڕیارە جێبەجێ دەکەن.

**مسرور بارزانی**
سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران
سەرۆکی لیژنەی باڵا

هاوپێچی ژمارە ٣

**سەرۆكایەتی ئەنجومەنی وەزیران**
**ژمارەی : ٤٤٩٤ لە ٢٠٢٠/٧/٢٩**

پشتبەست بە حوكمی ماددەی (١٨) لە یاسای خانەنشینی یەكگرتوو ژمارە (٢٧)ی ساڵی ٢٠٠٦ی هەمواركراو كارپێكراو لە هەرێمی كوردستان-عێراق، و بڕگەی (سێیەم) لە ماددەی (١) و ماددەی (٨) لە یاسای چاكسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەكان و خانەنشینی لە هەرێمی كوردستان-عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠، و پشتبەست بە بڕگەی (سێیەم) لە ماددەی (هەشتەم) لە یاسای ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەمواركراو، ئەنجومەنی وەزیران لە كۆبوونەوەی ئاسایی خۆی ژمارە (٣٤) لە ڕێكەوتی ٢٠٢٠/٧/١٥، و لەسەر پێشنیاری وەزارەتی دارایی و ئابووری، ئەم پەیڕەوە ناوخۆیەی دەركرد:

## پەیڕەوی ژمارە (٧)ی ساڵی ٢٠٢٠
## پەیڕەوی ناوخۆی سندوقی خانەنشینیی فەرمانبەرانی هەرێمی كوردستان - عێراق

### بەشی یەكەم
### پێناسەی زاراوەكان

**ماددەی (١):**

مەبەست لە ئەم وشە و دەستەواژانەی خوارەوە لە هەر شوێنێكی ئەم پەیڕەوەدا هاتبن ماناكانی بەرامبەریانە بۆ مەبەستەكانی ئەم پەیڕەوە:

**یەكەم: هەرێم:** هەرێمی كوردستان - عێراق.

**دووەم: وەزارەت:** وەزارەتی دارایی و ئابووری.

**سێیەم: وەزیر:** وەزیری دارایی و ئابووری.

**چوارەم: بەڕێوەبەرایەتی گشتی:** بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی.

**پێنجەم: سندوق:** سندوقی خانەنشینی فەرمانبەرانی هەرێم.

**شەشەم: بەڕێوەبەری گشتی:** بەڕێوەبەری گشتی خانەنشینی.

**حەوتەم: بەڕێوەبەر:** بەڕێوەبەری سندوق.

**هەشتەم: ئەنجومەنی بەڕێوەبردن:** ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی سندوق.

**نۆیەم: فەرمانبەر:** هەموو كەسێك وەزیفەیەكی پێ سپێردرابێت لە میلاكی بواری ڕاژەی شارستانی، سەربازی، و هێزەكانی ئاسایش و ئاسایشی ناوخۆ، كە مووچە لە بودجەی گشتی وەربگرێت و لە مووچەی فەرمانبەرێتی بڕینی خانەنشینی لێبكرێت، و ئەوانەی فەرمانبەری كەرتی گشتیش دەگرێتەوە.

**دەیەم: مووچەی فەرمانبەرێتی:** مووچەی بنەڕەتی بەبێ دەرماڵەکان ئەوەی فەرمانبەر وەری دەگرێت لەڕاژە

**یانزەیەم: ڕاژەی خانەنشینی:** ئەو ڕاژەیەی هەژمار دەکرێت بۆ مەبەستی خانەنشینی.

**دوانزەیەم: لێبڕینی خانەنشینی:** مەبەست لێبڕینی ڕێژەی (٧%) حەوت لە سەدی مووچەی مانگانەی فەرمانبەران یان هەر ڕێژەیەکی دیکە کە جێگەی دەگرێتەوە بەپێی یاسا کارپێکراوەکان.

**سیانزدەیەم: خانەنشین:** هەر فەرمانبەرێك شایستەی مووچەی خانەنشینی یان پاداشتی خانەنشینی دەبێت لەسەر ڕاژەکەی بەپێی یاساکانی خانەنشینی.

**چواردەیەم: پەیڕەو:** پەیڕەوی ناوخۆی سندوق.

## بەشی دووەم
## پەیوەستبوون و بەڕێوەبردن

**ماددەی (٢):**

سندوقی خانەنشینیی فەرمانبەرانی هەرێم دەبەسترێتەوە بە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خانەنشینی لە پێکهاتەی وەزارەت و کەسێتی مەعنەوی خۆی دەبێت.

**ماددەی (٣):**

**یەکەم:** سندوق فەرمانبەرێك بەڕێوەی دەبات کە پلەکەی یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی بێت، و دەبێت لانی کەم بڕوانامەی بەرایی زانکۆیی هەبێت و خاوەن شارەزایی و پسپۆڕیی بێت لە بواری تایبەتمەندییەکانی سندوق، و لەلایەن ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی سندوق دەپاڵێورێت، و تایبەتمەندییەکانی جێبەجێ دەکات بەپێی یاسا و پەیڕەو و ڕێنماییەکان، و لە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتانەی کە لەلایەن ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی سندوقەوە پێی دەدرێت.

**دووەم:** فەرمانبەرێك بە پلەی بەڕێوەبەر دەبێتە یاریدەدەری بەڕێوەبەری سندوق، کە دەبێت لانی کەم بڕوانامەی بەرایی زانکۆیی هەبێت و خاوەن شارەزایی و پسپۆڕی بێت و ئەو ئەرکانە جێبەجێ دەکات کە لەلایەن بەڕێوەبەری سندوقەوە پێی دەدرێت.

**سێیەم:** بەڕێوەبەری سندوق دەتوانێت هەندێك لە ئەرکەکانی بسپێرێت بە یاریدەدەر و بەڕێوەبەری بەشەکان و لقەکان.

**ماددەی (٤): تایبەتمەندییەکانی سندوق بریتیین لەمانەی خوارەوە:**

**یەکەم:** هەژمارکردنی بڕی پارەی ڕاگیراوی خانەنشینی و باجەکان.

**دووەم:** خەرجکردنی مافی خانەنشینی بۆ ئەوانەی بەپێی یاسا کارپێکراوەکان خانەنشین دەکرێن.

**سێیەم:** وەگەڕخستنی دارایی سندوق لە بواری وەبەرهێنان و گەشەپێدان و پارێزگاریکردنی.

**ماددەی (٥): سندوق ئەنجومەنێکی بەڕێوەبردنی دەبێت، کە پێکدێت لەمانەی خوارەوە:**

**یەکەم:** بەڕێوەبەری گشتیی خانەنشینی وەك سەرۆکی ئەنجومەن.

**دووەم:** بەڕێوەبەری سندوق وەك جێگری سەرۆکی ئەنجومەن و بڕیاردەر.

**سێیەم:** بەڕێوەبەری گشتی کاروباری یاسایی لە وەزارەت- ئەندام.

**چوارەم:** بەڕێوەبەری گشتیی بودجە لە وەزارەت- ئەندام.

**پێنجەم:** بەڕێوەبەری گشتی ژمێریاری گشتیی لە وەزارەت- ئەندام.

**شەشەم:** نوێنەری ئەم وەزارەت و لایەنانەی خوارەوە، وەك ئەندام دەبن لە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی سندوق کە دەبێت پلەیان بەڕێوەبەری گشتیی بێت:

١- وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە.

٢- وەزارەتی ناوخۆ.

٣- وەزارەتی پلاندانان.

٤- ئەنجومەنی ئاسایشی هەرێمی کوردستان.

٥- لقی هەرێمی بانکی ناوەندیی عێراق.

**حەوتەم:** ئەنجومەنەکە دەتوانێت شارەزایەك یان زیاتر لە پسپۆڕان بانگهێشت بکات بۆ کۆبوونەوەکانی بێ ئەوەی مافی دەنگدانیان هەبێت.

**ماددەی (٦):**

**یەکەم:** تایبەتمەندییەکانی ئەنجومەن بریتیین لە ئەمانەی خوارەوە:

١- ئامادەکردنی سیاسەتی گشتیی سندوق.

٢- دانانی پلانی بەڕێوەبردن و دارایی و ڕێکخستن و تەکنیکی پێویست بۆ بەڕێکردنی چالاکییەکانی سندوق و بەدیهێنانی ئامانجەکانی.

٣- بەدواداچوونی جێبەجێکردنی سیاسەت و پلانەکانی سندوق.

٤- پارێزگاریکردن لە پارەی سندوق و بەڕێوەبردن و وەبەرهێنانی بەپێی یاسا.

٥- ئامادەکردنی ژمێرەی کۆتایی و ڕاپۆرتی ساڵانەی سندوق و گفتوگۆکردن لە سەری و بەرزکردنەوەی بۆ وەزارەتی دارایی و ئابووری بۆ پەسەندکردنی.

٦- دانانی پلان و بودجەی ساڵانە و ڕوونکردنەوەی ئەوەی لێیان جێبەجێ کراوە.

٧- پێشنیازکردنی دیاریکردنی پاداشتی ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن و شارەزایان.

٨- پێشنیازکردنی هەموارکردنی پەیکەری بەڕێوەبردنی سندوق.

٩- پێشنیازکردنی کردنەوەی لقی سندوق لەسەر ئاستی پارێزگاکان لە ئاستی بەڕێوەبەرایەتی.

**دووەم:** ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی سندوق دەتوانێت هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی بە بەڕێوەبەری سندوق بسپێرێت.

## بەشی سێیەم

## کۆبوونەوەکانی ئەنجومەن

**ماددەی (٧):**

**یەکەم:** ئەنجومەن لانی کەم لە مانگێکدا جارێك کۆدەبێتەوە، کۆبوونەوەکە لەسەر بانگهێشتی سەرۆك دەبێت.

**دووەم:** دەکرێت کۆبوونەوەی نائاسایی ئەنجومەن ئەنجام بدرێت لەسەر داخوازییەکی نووسراوی دوو ئەندام یان زیاتری ئەنجومەنەکە.

**ماددەی (٨):**

**یەکەم:** بە ئامادەبوونی دوو لە سەر سێی ئەندامانی ئەنجومەن لە کۆبوونەوەکاندا، نیسابی یاسایی تەواو دەبێت.

**دووەم:** بڕیار و ڕاسپاردەکان بە زۆرینەی دەنگی ئەندامانی ئەنجومەن دەدرێت، و ئەگەر دەنگەکان یەکسان بوون ئەو لایەنە پەسەند دەکرێت کە سەرۆکی ئەنجومەن دەنگی بۆ داوە.

**ماددەی (٩):**

ماوەی خولی ئەنجومەن (٣) سێ ساڵە بۆ ئەو ئەندامانەی کە لە بڕگەی (شەشەم) لە ماددەی (٥)ی ئەم پەیڕەوە ناوخۆییە هاتوون و دەکرێت بۆ ساڵێکی دیکە درێژ بکرێتەوە، لە ڕێکەوتی یەکەم کۆبوونەوەیەوە ماوەی خولەکە دەست پێدەکات.

**ماددەی (١٠):**

**یەکەم:** بڕیارەکان و ڕاسپاردەکانی ئەنجومەن کە لە بەندەکانی (٥) و (٦) و (٧) و (٨) و (٩) لە بڕگەی (یەکەم) لە ماددەی (٦)ی ئەم پەیڕەوە ناوخۆییەدا هاتوون، دەبێت وەزیر پەسەندیان بکات، و بڕیارەکانی دیکەش یەکسەر لەگەڵ دەرچوونیان جێبەجێ دەکرێن.

**دووەم:** بڕیار و ڕاسپاردەکانی ئەنجومەن کە لە بڕگەی (یەکەم)ی ئەم ماددەیەدا هاتوون، بە پەسەندکراو هەژمار دەکرێن ئەگەر وەزیر لە ماوەی (٣٠) سی ڕۆژدا لەو ڕۆژەی کە لە نووسینگەکەی تۆمار دەکرێن، هیچ ناڕەزاییەکی دەرنەبڕی لە سەریان. ئەگەر ناڕەزایی دەربڕی، ئەوا دەگەڕێنرێنەوە بۆ ئەنجومەن، ئەگەر ئەنجومەن سووربوو لەسەر بڕیارەکەی، دانیشتنێك بە سەرۆکایەتی وەزیر ئەنجام دەدرێت و بڕیاری زۆرینەی ئەندامانی ئەنجومەن دەبێت بە بڕیاری کۆتایی.

## بەشی چوارەم
## پێکهاتەی سندوق

**ماددەی (١١):**

سندوق لەم بەشانەی خوارەوە پێکدێت و هەر بەشێك لەلایەن فەرمانبەرێك بە پلەی بەڕێوەبەر بەڕێوە دەبرێت کە لانی کەم بڕوانامەی بەرایی زانکۆیی هەبێت و خاوەن شارەزایی و پسپۆڕی بێت لە بواری تایبەتمەندێتی بەشدا:

**یەکەم:** بەشی کۆکردنەوەی ڕاگیراوی خانەنشینی.

**دووەم:** بەشی لێکۆڵینەوە و پلاندانانی دارایی و وەبەرهێنان.

**سێیەم:** بەشی داهات و باج.

**چوارەم:** بەشی کاروباری ژمێریاری.

**پێنجەم:** بەشی وردبینی و چاودێری ناوخۆیی.

**شەشەم:** بەشی تەکنۆلۆژیای زانیاری.

**حەوتەم:** بەشی یاسایی.

**هەشتەم:** بەشی کارگێڕی و خۆیەتی.

**نۆیەم:** بەشی خستنەسەری خزمەت.

**ماددەی (١٢):**

ئەرکەکانی ئەو بەشانەی پێکهاتەی سندوق کە لە ماددەی (١١)ی ئەم پەیڕەوەدا هاتوون، بەپێی ڕێنماییەك دیاری دەکرێن کە لەلایەن وەزیرەوە دەردەچێت .

**ماددەی (١٣): داهاتی سندوق لەمانەی خوارەوە پێکدێت:**

**یەکەم:** بڕی پارەی ڕاگیراوی خانەنشینی کە مانگانە دەبڕدرێت لە مووچەی فەرمانبەران و ئەوانەی لە خزمەتی گشتییدان.

**دووەم:** بەشداریکردنی هەرێم بە ڕێژەی (١٢%) دوازدە لە سەد لە مووچەی مانگانەی فەرمانبەران.

**سێیەم:** ئەو بڕە پارانەی کە لە فەرمانبەران و خانەنشینان وەردەگیرێت بەپێی یاسا کارپێکراوەکان.

**چوارەم:** ئەو بڕە پارانەی کە لە ئەنجامی وەبەرهێنانی مایەکانی سندوق بەدەست دێت.

**پێنجەم:** ئەو بڕە پارانەی کە لە ئەنجامی سزا و باج وەردەگیرێت.

**شەشەم:** بەخشین و هاوکاری لە ناوەوەی هەرێم کە پێشکەشی سندوق دەکرێت بە ڕەزامەندی وەزیر، و بەخشین و هاوکاری لە دەرەوەی هەرێم بە ڕەزامەندی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**حەوتەم:** بەخشینی ساڵانە لەلایەن وەزارەتەوە لە کاتی قەیرانی دارایی.

**ماددەی (١٤):**

**یەکەم:** دەبێت زانیاری تەواو و ورد و ژمارەی مووچەخۆران ڕادەستی سندوق بکرێت.

**دووەم:** سندوق داتابەیسێکی دەبێت بە شێوەیەك ئامادە بکرێت کە لەگەڵ مەبەستەکانی سندوق بگونجێت و زانیاریی سەرجەم فەرمانبەران و خانەنشینان لە خۆ بگرێت.

## بەشی پێنجەم
## حوکمە گشتی و کۆتاییەکان

**ماددەی (١٥):**

گشت داهاتەکانی سندوق جگە لە مەبەستەکانی هاتوو لەم پەیڕەوە ناوخۆییە بۆ هیچ مەبەستێکی دیکە خەرج ناکرێت.

**ماددەی (١٦):**

ژمێریاری سندوق دەکەوێتە بەر چاودێری و وردبینی دیوانی چاودێریی دارایی هەرێم.

**ماددەی (١٧):**

وەزیر بۆی هەیە ڕێنمایی پێویست بۆ ئاسانکاری جێبەجێکردنی حوکمەکانی ئەم پەیڕەوە ناوخۆییە دەربکات.

**ماددەی (١٨):**

ئەم پەیڕەوی ناوخۆییە لە ڕۆژی بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی فەرمی (وەقایعی کوردستان) دەکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە .

**مەسرور بارزانی**
**سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران**

### هۆیەکانی دەرچوواندنی ئەم پەیڕەوە ناوخۆییە

بە مەبەستی ڕێکخستنی کاروباری سندوقی خانەنشیی فەرمانبەرانی هەرێم و دیاریکردنی پێکهاتەی سندوق و ڕێکخستنی کاروباری ئەنجومەنی کارگێڕیی سندوق و دیاریکردنی ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە و زامنکردنی شایستەی خانەنشینان، ئەم پەیڕەوی ناوخۆییە دەرچووێندرا.

**وەزارەتی داد**

**ژمارە : ٣١ لە ٢٠٢٠/٧/٢٠**

**ڕێنمایی ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠٢٠**

بەپێی مادده (١١) لە یاسای بەر زەفتەکردنی فەرمانبەرانی دەوڵەت و کەرتی گشتی ژمارە (١٤) ی ساڵی ١٩٩١ هەموار کراو، پێویستە لەسەر فەرمانبەر (( ڕەچاو کردنی یاساکان و پەیڕەو و ڕێنماییەکانی تایبەت بە پاراستنی تەندروستی گشتی و سەلامەتی لە کار و خۆپاریزی لە ئاگر کەوتنەوە ))

ئەرکی نیشتیمانی و یاسایی و ئەخلاقی پێویست دەکات لەسەر گشت فەرمانبەرانی ئەم وەزارەتە بە گشت دەزگاکانی کارگێریەوە کەوا پابەندی تەواو بن بە ڕێنماییەکانی تەندروستی ئەوانەی کە دەردەچن لە لایەن لیژنەی باڵای بەرەنگار بوونەوەی ڤایرۆسی کۆرۆنا یاخود وەزارەتی تەندروستی لە هەرێم، بۆیە بڕیاری ئەمانەی خوارەوەمان دا:

١- پێویستە لەسەر گشت فەرمانبەران و کارمەندانی پێکهاتەکانی وەزارەت کەوا (ماسک) بەکاربهێنن لە کاتی ماوەی دەوامی فەرمی.
٢- پابەند کردنی گشت هاوڵاتیان بە بەکارهێنانی (ماسک) لە کاتی هاتووچۆ کردنیان بۆ فەرمانگەکانی وەزارەت و بەشەکانی و ڕێگری کردن لە هەر هاوڵاتیەک بۆ هاتنە ژوورەوە ئەگەر پابەند نەبوو.
٣- ڕێکاری یاسایی وەردەگیرێ بە بێ دوو دڵی بەرامبەر هەر فەرمانبەرێک یاخود کارمەندێکی وەزارەت ئەگەر پابەندی بڕیارەکانی سەرەوە نەبێت.
٤- سەرۆکی فەرمانگە بەرپرسیاریەتی یاسایی لە ئەستۆ دەگرێت لە کاتی بوونی هەر سستیەک یا هەر کەمتەرخەمیەک لە جێبەجێ کردنی ئەم ڕێنماییە.

**فەرسەت احمد عبدالله**
**وەزیـــری داد**

**هەولێر**
**٢٠٢٠ / ٧ /١٩**
**٢٨/ پوشبەر / ٢٧٢٠**

**وەزارەتی داد**

**ژمارە : ٣٣ لە ٢٠٢٠/٨/٩**

**ڕێنمایی ژمارە (١) ی ساڵی ٢٠٢٠**

هاووڕایی ( استئناسا ) بەبڕیاری دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر ( بەسیفەتی پێداچوونەوە ) ژمارە (١٥٢/ ت ت ٢٠١٩ ) لە ( ٢٠١٩/١٢/٢٢ ) سەبارەت بە هەڵگرتنی گلدانەوە و وەرگرتنی رەسمی وەرگرتنەوە و بەپێی یاسای وەرگرتنەوەی قەرزەکانی حکومەت ژمارە (٥٦) ساڵی ١٩٧٧ .

لە حاڵەتی داواکردنی قەرزدەر بە هەڵگرتنی گلدانەوە ( حجز ) لەسەر سامانی قەرزدار لەگەڵ نکۆلی کردنی لە وەرگرتنی بڕی قەرزەکە، ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە سامانی گلدراوە کاتێک بە گەرەنتی قەرز دادەنرێت لە هەمان کاتدا بە گەرەنتی رەسمی وەرگرتنەوەش دادەنرێت و داوای هەڵگرتنی گلدانەوەکە وا دادەنرێت کە لە بەرژەوەندی قەرزدارە و بە گرینەیەك (قرینە) بە وەرگرتنەوەی بەشێك یان هەموو قەرزەکە دادەنرێت لە دەرەوەی فەرمانگەی جێبەجێ کردن، بە شێوەیەك کە هەڵگرتنی گلدانەوەکە، گەرەنتی دەسکەوتنی رەسمی وەرگرتن بێ هێز دەکات و دەرگەی خۆ دزینەوە لە پێدانی رەسمی شایستە دەکاتەوە.

بۆیە پێویستە لەو بارەدا فەرمانگەکانی جێبەجێ کردن گلدانەوەکە هەڵنەگرن تاکو رەسمی وەرگرتنەوە نەدرێت لە لایەن ئەوەی ئەرکی دەکەوێتە سەر بەرێژەی ئەو سامانەی گلدراوەتەوە لە قەرزی قەرزدەر دوای خەمڵاندنی نرخی سامانی گلدراوەکە لە لایەن لیژنەیەکی سێ کەسی بە سەرۆکایەتی بەرێوەبەری جێبەجێ کردن، ئەمەش بۆ گەرەنتی سامانی گشتی.

**فەرسەت احمد عبدالله**
**وەزیری داد**

**هەولێر**
**٢٠٢٠ / ٨ / ٩**
**١٨ / خەرمانان / ٢٧٢٠**

**وەزارەتی دارایی و ئابووری**
**ژمارە : ٤٥٧٢ لە ٢٠٢٠/٧/١٩**

## ڕێنمایی ژمارە (١٤)ی ساڵی ٢٠٢٠
## ڕێنمایی تایبەت بە کەمکردنەوەی بوودجەی بەکاربردن

پاڵپشت بە بڕیاری کۆبوونەوەی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی ژمارە(٢٧) لە ٢٠٢٠/٥/٥ کە بە ژمارە دەرچووە بە نووسراوی ژمارە (٣٢٦٤) ٢٠٢٠/٦/١ بە دەستمان گەیشتووە وە نووسراوی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران (٤٠٣٩) لە ٢٠٢٠/٧/٨ بەمەبەستی کەم کردنەوەی خەرجییەکان بڕیاردرا بە :-

١- کەمکردنەوەی بوودجەی بەکاربردن (التشغيلية) بۆ نزمترین ئاست بە جۆرێک تەنیا بوارە سەرەکییەکان خەرجی بگرێتەوە وەکو (بواری دابین کردنی دەرمان و پێداویستی پزیشکی وتاقیگەیی و خواردنی نەخۆشخانەکان و زیندانییەکان و خانەی بە ساڵاچووان و نەوجەوانان و مندالان و شێلتەرەکانی ژنان و پاککردنەوەی شار و شارۆچکەکان و نەخۆشخانەکان و پێداویستییەکانی ئاو و کرێی وێستگەکانی بەرهەمهێنانی کارەبا و فەرمانگەکانی نەبەستراو بە وەزارەت.

٢- ڕاگرتنی هەر زیاد کردنێک لە پێشینەی مانگانەی سەرجەم وەزارەت و فەرمانگەکانی نەبەستراو بە وەزارەت.

٣-خەرج کردنی ڕێژەی (٥٠%)ی پێشینەی بەردەوامی مانگانەی ساڵی ٢٠٢٠ بۆ دام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان جگە لەم وەزارەت فەرمانگانەی خوارەوە:-

أ- خەرج کردنی ڕێژەی (٨٠%)ی پێشینەی بەردەوامی مانگانەی ساڵی ٢٠٢٠ بۆ وەزارەتی پێشمەرگە و یەکەی (٧٠ و ٨٠) و ئەنجومەنی ئاسایش و دەزگاکانی ئاسایش جگە لە لیوای نەوت ڕێژەی (٦٥%)ی بەردەوامی مانگانەی ساڵی ٢٠٢٠ بۆیان خەرج دەکرێت.

ب- خەرج کردنی ڕێژەی (٧٥%)ی پێشینەی بەردەوامی مانگانەی ساڵی ٢٠٢٠ بۆ ( بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس و بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی هاتووچۆ و بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستیەکان وبەڕێوەبەرایەتیەکانیان و نەخۆشخانەکانیان ، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کارەبا و بەڕێوەبەرایەتیەکانی دابەش کردنی کارەبا و بەڕێوەبەرایەتیەکانی چاککردنەوە و پاراستنی ڕێگا وبان و سەرۆکایەتی شارەوانییەکان و بەڕێوەبەرایەتی گشتی شارەوانییەکان و سەرۆکایەتییەکان و بەڕێوەبەرایەتی ئاوی شار و قەزا و ناحیەکان و دەوروبەریان.

ج- بۆ هەر زیادکردن و گۆڕانکارییەک لەو ڕێژانەی کە لە خاڵەکانی (أ و ب)ی سەرەوە هاتووە لە دەسەڵاتی وەزارەتماندایە.

٤- ڕاگرتنی هەموو جۆرە خەرجییەک لە سەر بوودجەی وەبەرهێنان ( پڕۆژەی وەزارەتەکان و پەرەپێدانی پارێزگاکان و پڕۆژەکانی دیکەی بوودجە جۆرا و جۆرەکان).

٥- پەیڕەو کردنی سیستەمی نوێی ئۆنلاین کە لە لایەن تیمی ڕاویژکاری لە نووسینگەی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران ئامادە کراوە بۆ خەرج کردنی بوودجەی بەکاربردن (التشغيلية) لە پێناو برەودان بە شەفافیەت و کەمکردنەوەی ڕۆتین.

٦- ڕاگرتنی هەموو جۆرە خەرجییەکی ڕاستەوخۆی وەزارەت و دەستە و لایەنەکانی نەبەستراو بە وەزارەت لە سەر بەشە داهاتی خۆیان.

٧- ئەم ڕێنماییە جێبەجێ دەکرێت لە بەرواری ٢٠٢٠/٧/١ دوای بڵاوبوونەوەی لە ڕۆژنامەی (وەقایعی کوردستان) بڵاودەکرێتەوە.

**ئاوات جەناب نوری**
**وەزیری دارایی و ئابووری**

**وەزارەتی دارایی و ئابووری**
**ژمارە : ٤٦٣١ لە ٢٠٢٠/٧/٢١**

## ڕێنمایی ژمارە (١٦)ی ساڵی ٢٠٢٠
## ڕێنمایی تایبەت بە لێخۆشبوونی قەرز بە ڕێژەی (١٥٪)

پاڵپشت بە بڕیاری کۆبوونەوەی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی ژمارە(٢٧) لە ٢٠٢٠ /٥/٥ کە بە ژمارە (٥٠) دەرچووە بە نووسراوی ژمارە (٣٢٦٤) لە ٢٠٢٠/٦/١ بە دەستمان گەیشتووە سەبارەت بە خالی (١٧) لە بواری داهات وە نووسراوی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ سکرتاریەتی ئەنجومەن ژمارە (٤٠٥٥) لە ٢٠٢٠/٧/٨ بڕیاردرابە:-

**١- پێشینەی خانووبەرە و پیشەسازی و کشتوکاڵی و گەشتیاری:**

أ- لێخۆشبوون بە ڕێژەی (١٥٪) لەوغرامە و پێشینەیی کە لە ئەستۆی هاووڵاتی ماوە ئەگەر بە یەک گووژمە بداتەوە بە شێوەی نقدی.

ب- لێخۆشبوون بە ڕێژەی لە (١٥٪) لەو پێشینەیی کە لە ئەستۆی هاووڵاتیانە و کاتی گەرانەوەی ماوە لەو ماوەیەی کە هاوڵاتی بۆی دیاری کراوە ئەگەر بە یەك گووژمە بداتەوە بە شێوەی نقدی.

**٢- پێشینەی هاوسەر گیری :**

أ- لێخۆشبوون بە ڕێژەی (١٥٪) لەو پێشینەیی کە لە ئەستۆی هاووڵاتی ماوە ئەگەر بە یەک گووژمە بداتەوە بە شێوەی نقدی.

ب- لێخۆشبوون بە ڕێژەی لە (١٥٪) لەو پێشینەیی کە لە ئەستۆی هاووڵاتیانە و کاتی گەرانەوەی ماوە لەو ماوەیەی کە هاوڵاتی بۆی دیاری کراوە ئەگەر بە یەك گووژمە بداتەوە بە شێوەی نقدی.

**٣- پێشینەی قەرزی بچووك:-**

أ- لێخۆشبوون بە ڕێژەی (١٥٪) لەوغرامە و پێشینەیی کە لە ئەستۆی هاووڵاتی ماوە ئەگەر بە یەک گووژمە بداتەوە بە شێوەی نقدی.

ب- لێخۆشبوون بە ڕێژەی لە (١٥٪) لەو پێشینەیی کە لە ئەستۆی هاووڵاتیانە و کاتی گەرانەوەی ماوە لەو ماوەیەی کە هاوڵاتی بۆی دیاری کراوە ئەگەر بە یەك گووژمە بداتەوە بە شێوەی نقدی.

٤- دوا ڕێکەوت بۆ جێبەجێ کردنی خاڵەکانی (٣،٢،١) ی سەرەوە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٩/١ دەبێت

٥- ئەم ڕێنماییە جێبەجێ دەکرێت لە بەرواری ٢٠٢٠/٧/١ و لە ڕۆژنامەی (وەقایعی کوردستان) بڵاودەکرێتەوە.

**ئاوات جەناب نوری**
**وەزیری دارایی و ئابووری**

**ئەنجومەنی دادوەری**
**ژمارە: ٨٥١ لە ٢٠٢٠/٧/٨**

**بەیانی ساڵی ٢٠٢٠**

پشت بەحوکمی ماددەی(٨) لە یاسای دەسەڵاتی دادوەری ژمارە (٢٣)ی ساڵی ٢٠٠٧ بڕیارماندا بە:-

**یەکەم:** دەست پێ کردنی پشووی دادگاکانی هەرێمی کوردستان- عێراق بۆماوەی (٣٠) رۆژ لەبەرواری ٢٠٢٠/٧/١

**دووەم:** ئەو کێشانەی پەیوەندییان بە ( کاروباری شارستانی و بازرگانی و باری کەسینەوە ) هەیە کە لەخوارەوە هاتووە بە کێشە و داوای بە پەلە دادەنرێن :-

١- وەرگرتنی داوانامە(عريضة الدعوى) و گلدانەوەی یەدەگ (الحجز الاحتياطي) و پێراگەیاندنی یاسایی

٢- ئەو کێشە و پرسە بە پەلانەی دەروازەی دەیەم لە کتێبی یەکەمی یاسای دادبینی شارستانی ژمارە(٨٣)ی ساڵی ١٩٦٩ دیاری کردوون.

٣- ئەو داوایانە گلدانەوەی سەرەتایی تێدایە یا داوای دواخستنی جێبەجێکردنی بریارێك یا مامەلەیەکی تێدا دەکات.

٤- داوای میری بۆ مولك سەندنەوە(استملاك)

٥- ئەو داوایانە داوالێکراو قەدەغە دەکرێت لە چوونە دەرەوەی هەرێم.

٦- داوای مایە پوچ بوون (افلاس) و هەر داوایەکی تر لێی بکەوێتەوە.

٧- داوای هەڵگرتنەوەی و لێك کرینەوە(شفعة) و پاکتاوکردنی وەقف و چۆڵکردنی بە کرێدراو.

٨- داواکانی تایبەت بە مافەکانی ئاودان و رێگەی جۆگەلە و سوولاوکە و هاتووچون (حقوق السقي وا الجري والمسيل والمرور) مافەکانی (ارتفاق).

٩- داوای پاکتاو کردنی کۆمپانیا و ئەو داوایانەی لێی دەبنەوە.

١٠-داواکانی راست کردنەوەی (تەمەن ، ناو ، نازناو )

١١-ئەو داوایانەی فەرمانگەی رسمی یان نیمچە رسمی دەزگا گشتیەکان تیادا لایەنە .

١٢-داواکردنی خەرجی بژێوی(نفقة) و دایەنی(حضانە) و دیتنی منداڵ و رەچەلەك (نسب).

١٣- داواکانی سەلماندنی پێگەیشتووی لێهاتووی (اثبات الرشد).

١٤-داواکانی لادانی سەرکار(قيم) و پێ سپێرداو ( وصی ).

١٥-داواکانی دابەشکردنی میرات و ئەو مامەلانەی لێیان دەکەونەوە.

١٦-ئەو داوایانەی یاسایەك بە پەلەی دانابێت.

**سێیەم:** جگە لەو داوا وکێشانەی لەبڕگەی دووەمی ئەو (بەیان)ە داهاتوو دادگا بۆی هەیە داوا لەماوەی پشووی دادگاکان ببینێت ئەگەر.

أ- بۆ دادگا دەرکەوت لە دواخستنی داواکە زیان دەکەوێتەوە.

ب- هەردوو لایەنی داواکە داوای دادبینی لە کاتی پشووی دادگاکان بکەن.

ج- داواکە گەیشتبووە قۆناغی کۆتایی.

**چوارەم:** گشت مامەلەکانی دادگا لە کاروباری ئاسایی خۆیان لە کاتی پشووی دادگاکان بەردەوام دەبن.

**دادوەر / بنگین قاسم محمد**
**سەرۆکی ئەنجومەنی دادوەری**

**وەزارەتی ناوخۆ**

**ژمارە : ٧٨٦٥ لە ٢٠٢٠/٦/١٤**

**بەیانی**

**ژمارە (٤٠)ی ساڵی ٢٠٢٠**

بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێمان دراوە لە هەردوو یاسای وەزارەتی ناوخۆ ژمارە (٦)ی ساڵی ٢٠٠٩ و یاسای هاتووچۆ ژمارە (٨٦)ی ساڵی ٢٠٠٤ی هەمواركراو و لەبەر بەرژەوەندی گشتی بڕیارماندا بە دەرچواندی ئەم بەیانە :-

**یەكەم:** وەرگرتنی بڕی (٥٠٠٠٠) تەنیا پەنجا هەزار دینار وەك رسوماتی ئەنجامدانی پشكنینی دەرەكی (كشف خارجی ) بۆ ئەو ئۆتۆمبێلانەی كە لە لایەن هاووڵاتیان و كۆمپانیاكان دەهێندرێنە بەرێوەبەرایەتیەكانی هاتووچۆ دەكەن بەمەبەستی پشكنینیان .

**دووەم:** ئەم بەیانە لە رۆژی دەرچوونیەوە جێبەجێ دەكرێت .

**رێبەر احمد**

**وەزیری ناوخۆ**

**وەزارەتی ناوخۆ**

**ژمارە : ٨٦٦٤ لە ٢٠٢٠/٦/٢٨**

**بەیانی ژمارە (٤٣)ی ساڵی ٢٠٢٠**

**هەمواری دووەمی ڕێنمایی ژمارە (٥)ی ساڵی ٢٠١٩ تایبەت بە پێدانی مۆڵەتی جام ڕەش**

بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێمان دراوە لە یاسای وەزارەتی ناوخۆ ژمارە (٦)ی ساڵی ٢٠٠٩ و دوابەدوای ڕێنماییمان ژمارە (٥)ی ساڵی ٢٠١٩ و هەمواری یەکەمی ئەم ڕێنماییە بە بەیانمان ژمارە (٤)ی ساڵی ٢٠٢٠ تایبەت بە پێدانی مۆڵەتی جام ڕەش بۆ ئۆتۆمبێل ، بڕیارماندا بە دەرچواندی ئەم بەیانە هەموارییە :-

**ماددەی یەکەم** : زیادکردنی بڕگەی (١٢) بۆ ماددەی پێنجەم لە ڕێنمایی سەرەوە دەبێتە بڕگەی (١٣ )

١٢- ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە لە بنەرەتەوە ڕێژەی ڕەشی جامەکانیان لە نێوان (٨١٪) تا (٩٠٪) ئەوا سەرەڕای وەرگرتنی پێبژاردنی ڕێژەیی (٨٠٪)ی جام ڕەشی ئەوا بڕی (٢٠٠٠٠٠) تەنیا دووسەد هەزار دیناری وەکو براوە (مقطوع) وەردەگیرێت

١٣- بڕی ئەو پارانەی سەرەوە کە لەم ماددەیە هاتووە دەخرێتە سەر حسابی پەرەپێدانی هاتووچۆی پارێزگاکان .

**ماددەی دووەم** : ئەم بەیانە لە ڕۆژی دەرچوونیەوە کاری پێدەکرێت و لەڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان بڵاودەکرێتەوە .

**ڕێبەر احمد**

**وەزیری ناوخۆ**

**وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی**

**ژمارە : ٢ لە ٢٠٢٠/٦/٩**

**بەیانی ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠**

بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێماندراوە لە ماددەی (حەوتەم / بڕگەی دووەم) لەیاسای وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی ژمارە (١٢)ی ساڵی ٢٠٠٧ بڕیارماندا بە:-

- هێنانە کایەی (استحداث)ی کردنی سەنتەرێکی ڕاهێنان بۆ قسەکردن لەسەر میلاکی بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی دهۆک / بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کەمئەندامانی دهۆک بەمەبەستی زیاتر خزمەتکردنی منداڵانی خاوەن پێداویستی تایبەت لەو دەقەرە .
- ئەم بەیانە جێبەجێ دەکرێت لە ڕۆژی دەرچوونیەوە .

**کوێستان محمد عبدالله**

**وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی**

---

**وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی**

**ژمارە : ٣٢٣ لە ٢٠٢٠/٧/٢١**

بەهۆی بوونی هەڵە لە بەیانی ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠١٩ کە لە ڕێکەوتی ٢٠١٩/١٠/٣١ دەرچووە بەپێویستمان زانی بەم شێوەیەی خوارەوە راستکردنەوەی بۆ بکرێت و لە ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان بڵاوی بکەینەوە .

**بەیانی ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠١٩**

بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێماندراوە لە ماددەی (حەوتەم / بڕگەی دووەم) لەیاسای وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی ژمارە (١٢)ی ساڵی ٢٠٠٧ بڕیارماندا بە:-

- هێنانە کایەی (استحداث)ی کردنی بنکەی کەمئەندامان لە قەڵادزێ سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی سلێمانی .
- ئەم بەیانە جێبەجێ دەکرێت لە ڕۆژی دەرچوونیەوە .

**کوێستان محمد عبدالله**

**وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی**

**وەزارەتی پەروەردە**

**ژمارە : ٦٦٢٨ لە ٢٠٢٠/٧/٢٧**

**بەیانی ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠٢٠**

بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێماندراوە لە ماددەی (٢٢) لەیاسای وەزارەتی پەروەردە ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراو بڕیارماندا بە:-

- کردنەوەی هۆبەیەک لەسەر میلاکی بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی دهۆک بەناوی هۆبەی (ستۆدیۆی دەنگ و ڕەنگ TV).

- ئەم بەیانە جێبەجێ دەکرێت لە رۆژی دەرچوونیەوە .

**ئالان حمه سعید صالح**

**وەزیری پەروەردە**

---

**وەزارەتی تەندروستی**

بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێماندراوە لە ماددەی (شەشەم / بڕگەی دووەم) لەیاسای وەزارەتی تەندروستی ژمارە (١٥)ی ساڵی ٢٠٠٧ بڕیارماندا بە:-

**بەیانی ژمارە (١٣)ی ساڵی ٢٠٢٠**

- کردنەوەی (نەخۆشخانەی وەفا) لە سنوری پارێزگای هەڵەبجە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی هەڵەبجە .

-ئەم بەیانە جێبەجێ دەکرێت لە رۆژی دەرچوونییەوە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٥/٣١.

**بەیانی ژمارە (١٤)ی ساڵی ٢٠٢٠**

- کردنەوەی (سەنتەری پشکنین و بەدواداچوونی مەمك بۆ نەخۆشیەکانی شێرپەنجە ) سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی کۆیە.

- ئەم بەیانە جێبەجێ دەکرێت لە رۆژی دەرچوونییەوە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٦/٨.

**د.سامان حسین بەرزنجی**

**وەزیری تەندروستی**

**وزارة العــدل**

**رقم: ٣٣ في ٢٠٢٠/٨/٩**

**تعليمات رقم ( ١ ) لسنة ٢٠٢٠**

**استئناساً بقرار محكمة استئناف منطقة اربيل ( بصفتها التمييزية ) رقم ( ١٥٢ / ت ت / ٢٠١٩ ) في (٢٠١٩/١٢/٢٢ ) حول رفع الحجز واستحصال رسم التحصيل بموجب قانون تحصيل الديون الحكومية رقم ( ٥٦ ) لسنة ١٩٧٧**

في حالة طلب الدائن رفع الحجز عن اموال المدين مع انكاره لاستلامه مبلغ الدين . ان يوخذ بنظر الاعتبار ان المال المحجوز حينما يعتبر ضمانا للدين يشكل في نفس الوقت ضمانا لرسم التحصيل وان طلب رفع الحجز يفترض ان يكون لمصلحة المدين ويشكل قرينة على استلام الدين جزئيا او كليا خارج دائرة التنفيذ وحيث ان رفعه يعتبر اضعافا لضمان استيفاء رسم التحصيل ويفتح ابوابا للتهرب من دفع الرسم المستحق عليه .

لذا على دوائر التنفيذ في هذه الحاله عدم رفع الحجز مالم يتم تسديد رسم التحصيل من قبل المكلف به بنسبة مايشكله المال المحجوز من دين الدائن بعد تقدير قيمة المال المحجوز من قبل لجنة ثلاثية برئاسة مدير التنفيذ وذلك ضمانا للمال العام .

**فەرسەت احمد عبدالله**
**وزيــــر العدل**

**<u>اربيل</u>**

**٩ / ٨ / ٢٠٢٠**

**١٨ / خەرمانان / ٢٧٢٠**

حكومة إقليم كوردستان-العراق
مجلس الوزراء
وزارة شؤون الشهداء والمؤنفلين
مكتب الوزير

حکومەتی هەرێمی کوردستان-عێراق
ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
نوسینگەی وەزیر

العدد:
التاريخ: ٢٣/ ٩ / ٢٠٢٠

ژمارە: ٧٧
ڕێکەوت: / ڕەزبەر/ ٢٧٢٠

هاوپێچی ژمارە ٤

**بۆ/ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ سەرۆکایەتی دیوان/ لیژنەی یاسایی ئەنجومەنی وەزیران**

**ب/ پێشنیار**

سەبارەت بە بڕگەی سێیەم لە ماددەی سێیەمی ڕەشنووسی پەیڕەوی دیاریکردنی ماف و ئیمتیازاتی میراتگرانی شەهیدان.

پێشنیار دەکەین بەم جۆرەی لێبکرێت.

ماددەی (٣):

سێیەم: تاکو دەرکردنی یاسای تایبەت بە پێدانی پلە و ئیمتیازات بۆ ئەو پێشمەرگانەی کە حوکمەکانی ماددەی(دووەم) و ماددەی(سێیەم)ی یاسای ڕێزلێنانی پێشمەرگە(زێرەڤانی)هەرێمی کوردستان-عێراق ژمارە(٣٣)ی ساڵی ٢٠٠٧ دەیانگرێتەوە، لەکاتی کۆچی دواییان هەمان مووچەی پێشوویان دەدرێت بە میراتگرانیان و هەمان ئیمتیازی شەهیدانی سەنگەریان دەبێت.

لەگەڵ ڕێزدا...

**عبدالله حاجی محمود**
**وەزیری کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان**
٢٣/ ٩/ ٢٠٢٠

وێنەیەک:
- دۆسیەی گشتی.

حکومەتی هەرێمی کوردستان – عیراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
نوسینگەی وەزیر

حكومة اقليم كوردستان – العراق
رئاسة مجلس الوزراء
وزارة شؤون الشهداء و المؤنفلين
مكتب الوزير

Kurdistan Regional Government _ Iraq
Council of Ministers
Ministry of Martyrs & Anfal Affairs
Minister office

هاوپێچی ژمارە ٥

ژمارە : ٣١
ساڵی کوردی : ١٣ /جۆزەردان/ ٢٧٢٠
ساڵی زاینی : ٢ /٦/ ٢٠٢٠

وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان – نووسینگەی وەزیر – دەرچوو

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران – فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون – ژمارە: ٢٩٩ – بەروار: ١٦/ ٦/ ٢٠٢٠ – وەرگیرا

فەرمانی وەزاری

لەژێر رۆشنایی راسپاردەکانی کۆبوونەوەی ژمارە (٢)ی لیژنەی چاکسازی وەزارەتمان لە بەرواری ٢٠٢٠/٥/١٨ ئاماژە بە ماددەی (٣) برگەی دووەم لە پەیرەوی ژمارە (٤) ساڵی ٢٠٢٠ پەیرەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان-عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠.

بریارماندا بە :-

پێکهێنانی لیژنەی لاوەکی وەزارەت لەم بەرێزانەی کە ناویان لە خوارەوە هاتووە بۆ بەرێوەبەرایەتی گشتی شەهیدان و ئەنفالکراوانی هەولێر بەمەبەستی جێبەجێکردنی بەشی دووەم ماددەی (٤) برگەی دووەم لە پەیرەوی یاسای چاکسازی .

١. داماو محمد حوێز — ب.گشتی هەولێر / سەرۆکی لیژنە
٢. فرهاد ابوبکر احمد — ب.شەهیدان / ئەندام
٣. زاهدە قادر سلێمان — ب.بانکی زانیاری / ئەندام
٤. احمد جمیل مصطفی — ب.یاسا / ئەندام
٥. حسین ابراهیم حسن — ب.ژمێریاری / ئەندام
٦. عارف محمد حسین — ل.د. مووچە / ئەندام
٧. صالح طه صالح — بەشی ئەرشیف / ئەندام
٨. بەرێوەبەری شەهیدانی قەزاکان بەپێی تایبەتمەندی لەکاتی پێویست

عبدالله حاجی محمود
وەزیری کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان

حکومەتی هەرێمی کوردستان-عێراق
ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
نوسینگەی وەزیر

حكومة إقليم كوردستان-العراق
مجلس الوزراء
وزارة شؤون الشهداء والمؤنفلين
مكتب الوزير

هاوپێچی ژمارە ٦

ژمارە: ٧٦ العدد:
ڕێکەوت: / رەزبەر/ ٢٧٢٠ التاريخ: ٢٣/ ٩ /٢٠٢٠

نووسینگەی وەزیر — وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان — دەرچوو

## بۆ/ سکرتاریەتی لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی

## ب/ ڕاسپاردە

بۆ جێبەجێکردنی برگەی سێیەمی ماددەی(٤) لە پەیڕەوی ژمارە(٤)ی ساڵی ٢٠٢٠ پەیڕەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ماف و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان-عێراق ژمارە(٢)ی ساڵی ٢٠٢٠.

ئەو فەرمان و بڕیار و ڕێنمایی و ڕێکارانە دەنێرین کە پێچەوانەی حوکمەکانی یاسای ماف و ئیمتیازاتی کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان لە هەرێمی کوردستان-عێراق ژمارە(٩)ی ساڵی ٢٠٠٧ی هەموارکراو دەرچوون، بۆ ئەوەی بڕیاریان لێبدرێت.

بۆ نموونە :

**١- خۆپیشاندانەکان :**

بە فەرمانی ئەنجوومەنی وەزیران ژمارە (٤٨١١) لە ڕێکەوتی ٢٠١١/٥/٨ قوربانیانی خۆپیشاندانەکانی ١٧ی شوبات کراون بە شەهیدی سەنگەر وە بە چەند فەرمانێکی دیکە قوربانیانی خۆپیشاندانەکانی تر کراون بە شەهیدی سەنگەر . ( تا ئێستا بە شێکیان مووچەکەیان وەرنەگرتوە ، تەنها فەرمانیان بۆ دەرچووە ) .

**٢- تۆپباران کراوە بە شەهیدی سەنگەر:**

بە فەرمانی ئەنجوومەنی وەزیران ژمارە (٢٧٤٣ ) لە ڕێکەوتی ٢٠١١/١١/٣ شەهیدی تۆپباران و بۆمبارانی فرۆکەی تورکیا و ئێران کراون بە شەهیدی سەنگەر ، بە واژۆی کاک ئازاد بەرواری جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران .

**٣- بەرکەوتەی چەکی کیمیاوی :**

بە فەرمانی ئەنجوومەنی وەزیران ژمارە (٧٢١) لە ڕێکەوتی ٢٠١٢/٣/١٢ مووچەیەکی مانگانە بە بڕی ٤٠٠ هەزار دینار بۆ هەر بەرکەوتەیەکی چەکی کیمیاوی بڕاوەتەوە ، بە ئیمزای بەڕێز د.بەرهەم صالح سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران .

٤- چەند ڕێنمایی و پەیڕەوێک کە هەندێک لە برگەکانیان پێچەوانەی حوکمەکانی (یاسای ماف و ئیمتیازاتی کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان)ن.

حکومەتی هەرێمی کوردستان-عێراق
ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
نوسینگەی وەزیر

حكومة إقليم كوردستان-العراق
مجلس الوزراء
وزارة شؤون الشهداء والمؤنفلين
مكتب الوزير

ژمارە:
العدد:

رێکەوت: / ڕەزبەر/ ٢٧٢٠
التاريخ: / / ٢٠٢٠

٥- ژمارەیەک فەرمان و بریاری دیکە کە بۆ حاڵەتەکان لەلایەن بەڕێزان سەرۆکەکانی ئەنجوومەنی وەزیران و جێگرەکانیان و و وەزیرەکانەوە دەرکراون کە لە کاتی ووردبینی و پێداچوونەوە بە دۆسیەی شەهیداندا ئەو فەرمان و بڕیارانە جیادەکەینەوە بۆ بڕیاردان لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە .

ڕاسپاردەکان :

١- دەرچوواندنی پەیڕەوێکی نوێ بۆ (ماف و ئیمتیازاتی کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان).

٢- دەرچوواندنی ڕێنمایی نوێ بۆ (یاسای ماف و ئیمتیازاتی کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان).

٣- فەرمانی دیاریکردنی مینحەی بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی نوێبکرێتەوە.

٤- دەرچواندنی پەیڕەوێکی نوێ بۆ ئیمتیازاتی زیندانیکراو و گیراوی سیاسی.

لەگەڵ ڕێزدا...

عبدالله حاجی محمود
وەزیری کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
٢٣/ ٩/ ٢٠٢٠

هاوپێچ:

- ژمارەیەک بڕیار و فەرمان و ڕێنمایی و پەیڕەو

وێنەیەک:

- دۆسیەی گشتی

حكومة اقليم كوردستان -العراق
رئـاسـة مـجلـس الــوزراء
وزارة شـــؤون الـشـهداء و الـمؤنفلين
مكتب الـوزيـر

Kurdistan Regional Government _ Iraq
Council of Ministers
Ministry of Martyrs & Anfal Affairs
Minister office

حکومەتی هەرێمی کوردستان – عیراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
نـوسینگەی وەزیــر

هاوپێچی ژمارە ٧

ژمارە : ٤٣
ساڵی کوردی : ١٠ / پوشپەڕ / ٢٧٢٠
ساڵی زاینی : ٣٠ / ٦ / ٢٠٢٠

## فەرمانی وەزاری

لەبەر رۆشنایی بڕگەی دووەمی ماددەی(٥) لە بەشی دووەمی پەیرەوی ژمارە(٤)ی ساڵی ٢٠٢٠ پەیڕەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان – عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠.

بڕیارماندا بە:-

هەڵپەساردنی تۆماری نوێی زیندانی و گیراوی سیاسی لەلایەن لیژنە تایبەتمەندەکانەوە تاکو ئەرکی ووردبینی و پێداچوونەوە و پاککردنەوەی لیستەکانیان تەواو دەبێت .

**عبداللە حاجی محمود**
**وەزیــری کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان**

**وێنەیەک بۆ:-**

- ✓ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران / سەرۆکایەتی دیوان... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ سەرۆکایەتی فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون بۆ زانین ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ سکرتاریەتی ئەنجوومەنی وەزیران... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ وەزارەتی دارایی و ئابووری ...لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ دەستەی دەستپاکی ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ دیوانی چاودێری دارایی ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ سەرۆکایەتی داواکاری گشتی ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ نووسینگەی بریکاری وەزارەت .
- ✓ راوێژکار .
- ✓ بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان .
- ✓ بەڕێوەبەرایەتی کاروباری زیندانیە سیاسیەکان / بۆ کاری پێویست ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ لیژنە تایبەتمەندەکانی زیندانیانی سیاسی . بۆ کاری پێویست ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ لیژنەی ڕاسپێردراوی پێداچوونەوە بە دۆسیەی زیندانیکراو و گیراوی سیاسی ... بۆ کاری پێویست ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ دۆسیەی گشتی.

حکومەتی هەرێمی کوردستان – عیراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
نوسینگەی وەزیـر

حكومة اقليم كوردستان – العراق
رئاسة مجلس الوزراء
وزارة شؤون الشهداء و المؤنفلين
مكتب الوزير

Kurdistan Regional Government _ Iraq
Council of Ministers
Ministry of Martyrs & Anfal Affairs
Minister office

هاوپێچی ژمارە ٨

ژمارە : ٢٩
ساڵی کوردی : ١٣ /جۆزەردان/ ٢٧٢٠
ساڵی زاینی : ٢ /٦/ ٢٠٢٠

## فەرمانی وەزاری

ئاماژە بە ماددەی (٥) بڕگەی یەکەم لە پەیرەوی ژمارە (٤) ساڵی ٢٠٢٠ پەیرەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان-عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠.

بریارماندا بە :-

پێکهێنانی لیژنەیەک لەم بەرێزانەی ناو و ناونیشانیان لە خوارەوە هاتووە بەمەبەستی جێبەجێکردنی ماددەی (٢-سێیەم) لە یاسای چاکسازی .

١. نەورۆز محی الدین قازی سەرۆکی فەرمانگەی یاسایی/ دیوانی ئەنجومەنی وەزیران سەرۆکی لیژنە
٢. مریەم عوسمان باپیر ب.گشتی / وەزارەتی دارایی و ئابووری ئەندام
٣. ئەدیب لەتیف محمد ب.گشتی / وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان ئەندام

عبداللە حاجی محمود
وەزیری کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان

حكومة اقليم كوردستان -العراق
رئاسة مجلس الوزراء
وزارة شؤون الشهداء و المؤنفلين
مكتب الوزير

Kurdistan Regional Government _ Iraq
Council of Ministers
Ministry of Martyrs & Anfal Affairs
Minister office

حكومەتی هەرێمی کوردستان – عیراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
نوسینگەی وەزیر

هاوپێچی ژمارە ٩

ژمارە : ٤٥
ساڵی کوردی : ١٠ / پوشپەڕ / ٢٧٢٠
ساڵی زایینی : ٣٠ / ٦ / ٢٠٢٠

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون
ژمارە ٤٨٤
بەروار ٢ / ٧ / ٢٠٢٠
وەرگیرتە

وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
نووسینگەی وەزیر
دەرچوو

## فەرمانی وەزاری

لەبەر رۆشنایی برگەی سێیەمی ماددەی(٥) لە بەشی دووەمی پەیرەوی ژمارە(٤)ی ساڵی ٢٠٢٠ پەیرەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان – عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠.

بریارماندا بە:-

راسپاردنی بەڕێوەبەرایەتی کاروباری زیندانییە سیاسییەکان و بانکی زانیاری وەزارەتمان بۆ هەماهەنگی کردن لەگەڵ لیژنەی باڵای بایۆمەتری و فەرمانگەی تەکنەلۆجیای زانیاری لە ئەنجوومەنی وەزیران بۆ بە ئەلیکترۆنی کردنی لیستەکانی زیندانیکراو و گیراوی سیاسی .

عبدالله حاجی محمود
وەزیـری کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان

**وێنەیەک بۆ:-**

- ✓ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران / سەرۆکایەتی دیوان... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ سەرۆکایەتی فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون بۆ زانین ... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ سکرتاریەتی ئەنجوومەنی وەزیران... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ وەزارەتی دارایی و ئابووری ...لەگەڵ رێزدا .
- ✓ دەستەی دەستپاکی ... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ دیوانی چاودێری دارایی ... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ سەرۆکایەتی داواکاری گشتی ... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ نووسینگەی بریکاری وەزارەت .
- ✓ راوێژکار .
- ✓ بەرێوەبەرایەتی گشتی دیوان .
- ✓ لیژنەی باڵای بایۆمەتری/ بۆکاری پێویست ... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ فەرمانگەی تەکنەلۆجیای زانیاری لە ئەنجوومەنی وەزیران/ بۆ کاری پێویست ... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ بەرێوەبەرایەتی کاروباری زیندانیە سیاسیەکان / بۆ کاری پێویست ... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ بانکی زانیاری / بۆکاری پێویست ... لەگەڵ رێزدا .
- ✓ دۆسیەی گشتی.

| | | |
|---|---|---|
| إقليم كوردستان ـ العراق<br>رئاسة مجلس الوزراء<br>دائرة تكنولوجيا المعلومات | Kurdistan Regional Government<br>Council of Ministers<br>Department of Information Technology | هەرێمی کوردستان ـ عێراق<br>سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران<br>فەرمانگەی تەکنەلۆجیای زانیاری |

221
2019/12/23

٢٢١
٢ بەفرانبار ١٩

هاوپێچی ژمارە ١٠

بۆ: وەزارەتی شەهیدان وئەنفالکراوەکان

ئەنجامی تۆماری بایۆمەتری

لە رێکەوتی ٢٠٢٠/٩/٣٠ لە لایەن فەرمانگەی تەکنەلۆجیای زانیاری ئەنجامی تۆماری بایۆمەتری زیندانیانی سیاسی لە وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوەکان (لیست و فایلی٥٠٩١ تۆمار کراو کە ٤٢٨٧ فایلی دوموچەیی لە خۆیەوە دەگرێت)، رادەستی بەرێز زێرەڤان مجید پیرۆ کرا .

لە گەڵ رێزماندا...

٢٠/٩/٢٠٢٠

فەرمانگەی تەکنەلۆجیای زانیاری

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
ژمارە :
رێکەوت :
فەرمانگەی تەکنەلۆجیای زانیاری

هەرێمی کوردستان - عیراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی دارایی و ئابووری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی ژمێرکاری
ب/ دیراسات و لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون

Kurdistan Region – Iraq
Presidency Council of Ministers
Ministry of Finance & Economy
General Directorate of Accounting

اقليم كوردستان - العراق
رئاسة مجلس الوزراء
وزارة المالية والاقتصاد
مديرية المحاسبات العامة
م/ الدراسات و الابحاث و المتابعة

ژمارە: ٩ / ٤ / ٢١٠٢١ ڕێکەوت: / / ٢٧٢٠ کوردی ڕێکەوت: ٢٠٢٠/٩/١٤ زایینی

هاوپێچی ژمارە ١١

## ڕێنمایی دارایی ژمارە (١٩)

**بۆ/ وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان**

**ب/ میراتگری زیندانی کراو گیراوی سیاسی**

بەپێ ی ماددەی (٢) برگەی (چوارەم) لە یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی هەرێمی کوردستان - عیراق و ژمارە (٢)ی ساڵی / ٢٠٢٠ و ماددەی (٦) لە بەشی دووەم لە پەیرەوی ژمارە (٤)ی ساڵی / ٢٠٢٠ جێ بەجێکردنی یاسای چاکسازی وە ئاماژە بە کۆبوونەوەی لیژنەی دەرکردن و پێداچوونەوەی ڕێنمایی دارایی لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٦/٢١ بڕیار درا بە :-

١- لە کاتی مردنی زیندانیکراو و گیراوی سیاسی بەپێ ی یاسای خانەنشینی بەرکار لە هەرێمی کوردستان مامەڵە لەگەڵ میراتگرەکانیان دەکرێت .

٢- ئەو ڕێنماییە لە ٢٠٢٠/٧/١ جێ بەجێ دەکرێت و لە ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان بڵاو دەکرێتەوە .

**ئاوات جەناب نوری**
**وەزیری دارایی و ئابووری**

وێنەیەک بۆ/

- سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- پەرلەمانی کوردستان - عێراق .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ سەرۆکایەتی دیوان/ ف ـ ك ـ کارگێری و دارایی/بۆ ئاگاداریتان ...لەگەڵ ڕێزدا .
- وەزارەتی د.اد / بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان / بۆ ئاگاداریتان و بڵاوکردنەوەی ... لەگەڵ ڕێزدا.
- ئەنجوومەنی دادوەری .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- دیوانی چاودێری دارایی هەرێمی کوردستان .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- دەستەی دەسپاکی .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن و ڕاپرسی .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- نووسینگەی بەڕێز وەزیری دارایی و ئابووری / بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- نووسینگەی بەڕێز بریکاری وەزارەت / بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا.
- دەستەی ڕاوێژکاران لە دیوانی وەزارەتمان.. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- گشت بەڕێوەبەرایەتیە گشتیەکانی سەر بە وەزارەتمان / بۆ گشتاندنی ... لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان/ ب ـ چاودێری و پشکنینی دارایی .. بۆ ئاگاداریتان و کاری پێویست ... لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان/ ب ـ ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکان .. بۆ ئاگاداریتان و کاری پێویست ... لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی گەنجینەی هەرێم/ هەولێر/ (١و٢)ی سلێمانی/ دهۆك/ هەڵەبجە/ گەرمیان/ سۆران/ ڕاپەرین/ ئاکرێ/ کۆیە/ زاخۆ/ چەمچەماڵ/ ئامێدی / بۆ زانین و کاری پێویست .
- گشت بەڕێوەبەرایەتی و بەش و هۆبەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتیمان .
- بەڕێوەبەرایەتی / دیراسات و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون .
- دۆسیەی سوراو .

Hawller/ Beside Sami Abdulrahman Park
Phone: 2560068-2560069-2528254

٢٠٢٠/٩/١٥ هناء
Email: gd_finance@yahoo.com

هەولێر/ تەنیشت پارکی سامی عبدالرحمان
تەلەفۆن : ٢٥٦٠٠٦٨ – ٢٥٦٠٠٦٩ – ٢٥٢٨٢٥٤

| | | |
|---|---|---|
| هەرێمی کوردســـتان - عیراق<br>سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران<br>وەزارەتــی دارایــی و ئابووری<br>بەڕێوەبەرایەتی گشتی ژمێرکاری<br>ب/ دیراسات و لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون | Kurdistan Region – Iraq<br>Presidency Council of Ministers<br>Ministry of Finance & Economy<br>General Directorate of Accounting | اقليم كوردســتان - العراق<br>رئاسـة مجلس الوزراء<br>وزارة المالية والاقتصاد<br>مديرية المحاسبات العامة<br>م/ الدراسات و الابحاث و المتابعة |

ژمارە: ٩ / ٤ / ٢٠٢١ ڕێکەوت: / / ٢٧٢٠ کوردی ڕێکەوت: / / ٢٠٢٠ زایینی

هاوپێچی ژمارە ١٢

## ڕێنمایی دارایی ژمارە ( ٤ )

### بۆ/ وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان

### ب/ خزمەتگوزاری خوێندن و تەندروستی کەس و کاری شەهیدان و ئەنفال کراوان زیندانیای سیاسی

پاڵپشت بە ماددەی (٢) بڕگەی پێنجەم لە یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە بەخشین و ئیمتیازاتەکانی خانەنشینی هەرێمی کوردستان - عیراق ژمارە (٢)ی ساڵی / ٢٠٢٠ و ماددەی (٧) ئاماژە پێکراو لە بەشی دووەم بڕگەی یەکەم لە پەیرەوی ژمارە (٤)ی ساڵی / ٢٠٢٠ جێ بەجێکردنی یاسای چاکسازی وە ئاماژە بە کۆبوونەوەی لێژنەی دەرکردن و پێداچوونەوەی ڕێنمایی دارایی لە ڕێکەوتی (٢٠٢٠/٦/٢١) بڕیاردرا بە:-

**یەکەم/ خزمەت گوزاری خوێندن:-**

١- خزمەتگوزاری کرێ ی خوێندن تەنها (کچ ، کور ، هاوسەر کە هاوسەرگیری نەکردۆتەوە) ی شەهیدانی سەنگەر و جینۆساید لە قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆکانی ناوخۆی هەرێمی کوردستان لەبەر ڕۆشنایی یاسا بەرکارەکان خەرج دەکرێت .

٢- ( وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان ) لە ڕێگەی ( وەزارەتی دارایی و ئابووری ) ، بۆ هەر ساڵێکی خوێندن لە قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆ حکومی و ئەهلییەکان کرێی خوێندن دەگرێتە ئەستۆ .

٣- وەرگرتنی قوتابی و خوێندکار بەپێ ی یاسا و ڕێنماییەکانی (وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی) و (وەزارەتی پەروەردە) ی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت .

٤- دوو جار کرێی خوێندن بۆ هەمان قۆناغی خوێندن خەرج ناکرێت ، بەهۆی (دواخستن ، مۆڵەت ، گواستنەوە ، دەرنەچوون ).

٥- قوتابی و خوێندکار زیاتر لە جارێك سوودمەند نابێت لە کرێ ی خوێندن لە پەیمانگا و زانکۆ حکومی و ئەهلیەکان ، تەنها لە حاڵەتی بە دەستهێنانی بڕوانامەی بەرزتر کرێ ی خوێندنی بۆ خەرج دەکرێت.

٦ - قوتابی خوێندکار لە هەر قۆناغێکی خوێندن دەربکرێت (فصل) بە پێ ی ڕێنماییەکانی (وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی ) و (وەزارەتی پەروەردە) لە قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆیەکی تر وەربگیرێتەوە ئەوا کرێ ی خوێندنی قۆناغەکانی پێش دەرکردنی بۆ خەرج ناکرێت .

٧- وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان بەرپرس نییە لەو خەرجییەی لە لایەن هەر قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆیەکەوە لە قوتابی و خوێندکار وەردەگیرێت لە بڕی تاقیکردنەوەی خوولی دووەم .

٨- یەکەمەکانی قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆکان کە بە پێ ی یاساکانی ڕێنماییەکانی (وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی) و (وەزارەتی پەروەردە) لە کرێ ی خوێندن دەبەخشرێن ، کرێ ی خوێندنەکە دەگەڕێتەوە بۆ قوتابی و خوێندکارە یەکەمەکان .

٩- هەر قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆیەك خوێندنی بێ بەرامبەری بۆ کەس و کاری شەهیدان دابینکرد ، ئەگەر قوتابی و خوێندکارەکە یەکەم بوو وەك خاڵی هەشتەم مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت .

١٠- زیندانی کراو و گیراوی سیاسی (ئەوەی مینحەی مانگانە وەردەگرێت) ، بە هەمان ڕێنمایی (کچ و کوڕ) ی شەهیدان کرێی خوێندنی بۆ خەرج دەکرێت بۆ خۆی یان یەکێك لە منداڵەکانی بۆ یەکجار تەنها لە یەکێك لە زانکۆکانی هەرێمی کوردستان لە بەر ڕۆشنایی بڕگەی پێنجەم ماددەی (٦) بەشی سێیەم لە یاسای ژمارە (١١)ی ساڵی ٢٠١١/ (یاسای ماف و ئیمتیازاتی زیندانی کراو و گیراوی سیاسی کوردستانی) هەموارکراو .

١١- بە پشت بەستن بە بڕگەی (دووەم) لە ماددەی (٧) ی پەیڕەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان بە شێوەیەکی بەردەوام زانیاری تەواو و باوەڕپێکراو ئامادە دەکات بۆ هەماهەنگیکردن لە نێوان وەزارەتە پەیوەندیدارەکان بۆ داڕشتنی پلان و خەرجییەکانی ساڵانە .

١٢- بە پشت بەستن بە بڕگەی (سێیەم ) لە ماددەی (٧) پەیڕەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی ، بەڕێوەبەرایەتی گشتی خزمەتگوزاری کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان لە وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان هەماهەنگی دەکات لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی خەرجییەکان لە وەزارەتی دارایی و ئابووری بۆ ڕێکخستن و سەرپەرشتی کردن و خەرجییەکان .

١٣- پێشکەشکردنی پسولەی خەرجی خوێندن لە دەستپێکی ساڵی خوێندن تا ماوەی شەش مانگ دەبێت .

١٤- ئەو کورسیانەی خوێندنی خۆرایی کە لەلایەن دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان بەپێ ی ڕێنمایی ژمارە (٣) ی ساڵی ٢٠٢٠/ ی وەزارەتی پەروەردە بۆ کچ و کوڕ و هاوسەری شەهیدان تەرخان دەکرێت , وەك تەرخانکراوی تایبەتی ئەو دامەزراوانە لەم ڕێنماییە بەدەردەبن.

**دووەم / خزمەتگوزاری و تەندروستی :-**

١- کەسوکاری شەهیدان (دایك ، باوك ، هاوسەر ، کچ ، کوڕ ، خوشك ، برا) لە کرێی پشکنین و چارەسەرکردن لە نەخۆشخانە و مەڵبەندە تەندروستیەکانی حکومەت لە ناو هەرێم دەبووردرێن .

٢- زیندانی کراو و گیراوی سیاسی (ئەوەی مینحەی مانگانە وەردەگرێت) حکومەت خەرجی چارەسەرکردنی خۆی لە نەخۆشخانە حکومییەکانی ناو هەرێم دابین دەکات ، لە بەر ڕۆشنایی بڕگەی شەشەم ماددەی (٦) ی بەشی سێیەمی لە یاسای ژمارە (١١) ی ساڵی ٢٠١١/ یاسای (ماف و ئیمتیازاتی زیندانی کراو و گیراوی سیاسی کوردستانی) هەموارکراو .

٣- بەرکەوتەی چەکی کیمیاوی کە پێویستی بە چارەسەری بەردەوام هەیە حکومەتی هەرێمی کوردستان بەپێی دەفتەری تایبەت لە ڕێگەی (وەزارەتی تەندروستی) یەوە بەبێ بەرامبەر چارەسەر و دەرمانی بۆ دابین دەکرێت.

٤- ئەم ڕێنماییە لە ساڵی (٢٠٢٠- ٢٠٢١ ) بە دواوە جێ بە جێ دەکرێت و لە وەقائعی کوردستان بڵاودەکرێتەوە

ئاوات جەناب نوری

وەزیری دارایی و ئابووری

وێنەیەك بۆ/

- سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- پەرلەمانی کوردستان - عێراق .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ سەرۆکایەتی دیوان/ ف ـ ك ـ کارگێری و دارایی/بۆ ئاگاداریتان ...لەگەڵ ڕێزدا .
- وەزارەتی داد / بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان / بۆ ئاگاداریتان و بڵاوکردنەوەی ... لەگەڵ ڕێزدا.
- ئەنجوومەنی دادوەری .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- دیوانی چاودێری دارایی هەرێمی کوردستان .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- دەستەی دەسپاکی .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن و ڕاپرسی .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- نووسینگەی بەڕێز وەزیری دارایی و ئابووری / بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- نووسینگەی بەڕێز بریکاری وەزارەت / بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا.
- دەستەی ڕاوێژکاران لە دیوانی وەزارەتمان.. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ ڕێزدا .
- گشت بەڕێوەبەرایەتیە گشتیەکانی سەر بە وەزارەتمان / بۆ گشتاندنی ... لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان/ ب ـ چاودێری و پشکنینی دارایی .. بۆ ئاگاداریتان و کاری پێویست ... لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان/ ب ـ ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکان .. بۆ ئاگاداریتان و کاری پێویست ... لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی گەنجینەی هەرێم/ هەولێر/ (١و٢)ی سلێمانی/ دهۆك/ هەڵەبجە/ گەرمیان/ سۆران/ ڕاپەڕین/ ئاکرێ/ کۆیە/ زاخۆ/ چەمچەماڵ / ئامێدی / بۆ زانین و کاری پێویست .
- گشت بەڕێوەبەرایەتی و بەش و هۆبەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتیمان .
- بەڕێوەبەرایەتی / دیراسات و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون .
- دۆسیەی سوڕاو .

حكومەتی هەرێمی کوردستان – عیراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان
نوسینگەی وەزیر

حكومة اقليم كوردستان -العراق
رئـاسـة مـجلـس الـوزراء
وزارة شـؤون الـشـهداء و الـمؤنفلين
مكتب الـوزيـر

Kurdistan Regional Government _ Iraq
Council of Ministers
Ministry of Martyrs & Anfal Affairs
Minister office

هاوپێچی ژمارە ١٣

ژمارە : ٤٤
ساڵی کوردی : ١٠ / پوشپەڕ / ٢٧٢٠
ساڵی زاینی : ٣٠ / ٦ / ٢٠٢٠

## فەرمانی وەزاری

لەبەر ڕۆشنایی بڕگەی دووەمی ماددەی (٧) لە بەشی دووەمی پەیرەوی ژمارە(٤)ی ساڵی ٢٠٢٠ پەیڕەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان – عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠.

بڕیارماندا بە :-

ڕاسپاردنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی خزمەتگوزارییەکان و بانکی زانیاری لە دیوانی وەزارەتمان کە بەردەوام زانیاری تەواو و باوەڕپێکراو ئامادە بکەن لە بارەی کەس وکاری شەهیدان کە بڕگەی یەکەمی ماددەی (٧) لە بەشی دووەمی پەیرەوی یاسای چاکسازی دەیانگرێتەوە ، بە پێی تەمەن و قۆناغی خوێندن ، تاکو لەنێوان وەزارەتە پەیوەندیدارەکان هەماهەنگی بکرێت و پلانی ساڵانەی پێویست بۆ خەرجییەکان دابڕێژرێت .

**عبدالله حاجی محمود**
**وەزیـری کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان**

**وێنەیەک بۆ:-**

- ✓ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران / سەرۆکایەتی دیوان... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ سەرۆکایەتی فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون بۆ زانین ... لەگەڵ ریزدا .
- ✓ سکرتاریەتی ئەنجوومەنی وەزیران... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ وەزارەتی دارایی و ئابووری ...لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی...لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ وەزارەتی پەروەردە ...لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ وەزارەتی تەندروستی ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ دەستەی دەستپاکی ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ دیوانی چاودێری دارایی ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ سەرۆکایەتی داواکاری گشتی ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ نووسینگەی بریکاری وەزارەت .
- ✓ ڕاوێژکار .
- ✓ بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان .
- ✓ بەڕێوەبەرایەتی گشتی خزمەتگوزاری / بۆ کاری پێویست ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ بانکی زانیاری / بۆ کاری پێویست ... لەگەڵ ڕێزدا .
- ✓ دۆسیەی گشتی.

کوردستان : هەولێر - شەقامی سی مەتری - نزیك پردی سەیداوە saud_s١٩٨١@yahoo.com ت / ٠٦٦-٢٢٣٣١٩٨ ٠٧٥٠٤٦٥٩٠٠٦

هەرێمی کوردستان-عێراق
ئەنجوومەنی وەزیران
وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی
نووسینگەی وەزیر

KURDISTAN REGIONAL GOVERNMENT
COUNCIL OF MINISTERS
MINISTRY OF Labor and Social Affairs

أقليم كوردستان-العراق
مجلس الوزراء
وزارة العمل والشؤون الاجتماعية
مكتب الوزير

ژمارە : ٤٥
ڕێکەوت ٢٠٢٠/٨/٢٦
No :
Date :

هاوپێچی ژمارە ١٤

٢٧٢٠ کوردی

بۆ/ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/سەرۆکایەتی دیوان

بابەت/ پەیڕەوی تۆڕی پاراستنی خێزان لەسەر بنەمای هەژاریی

وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی
دەرکردە

به مەبەستی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان **یاسای ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠**. بەپێی **ماددەی (٣) بڕگەی (یەکەم)** لە بەشی نەهێشتنی سوودمەندبوون لە جارێك زیاتر لە بودجەی گشتی و لە ژێر ڕۆشنایی جێبەجێکرنی **ماددەی (٩) بڕگەی (یەکەم – دووەم – سێیەم )** لە پەیڕەوی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان – عێراق **ژمارە (٤) ی ساڵی ٢٠٢٠**، هاوپێچ لەگەڵ نوسراوماندا پەیڕەوی تۆڕی پاراستنی خێزان لەسەر بنەمای هەژاریی ئاماژە پێکراو لە خشتەی پلانی جێبەجێکردنی پەیڕەوی ناوبراو لە ماددەی (٩) بڕگە سێیەم هاتووە بۆتان ڕەوانە دەکەین فەرمانتان.

لەگەڵ ڕێزدا...

**هاوپێچ:**

- پەیڕەوی تۆڕی پاراستنی خێزان لەسەر بنەمای هەژاریی

**کوێستان محمد عبدالله**
**وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی**

٨/٢٦

وێنەیەك بۆ :

- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران.سکرتاریەتی ئەنجومەن .
- فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون. نوسینگەی سەرۆکی فەرمانگە.
- نووسینگەی جەنابی وەزیر. لەگەڵ بەراییەکان.
- نوسینگەی بریکاری وەزارەت.
- بەڕێوەبەری گشتی دیوان.
- ب. کاروباری یاسایی.

نووسینگەی وەزیر
Minister Bureau
Dr.hogr

ناونیشان: هەولێر – گەڕەکی شۆڕش
العنوان : أربيل- محلة شورش

هەرێمی کوردستان-عێراق
ئەنجوومەنی وەزیران
وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی
نووسینگەی وەزیر

KURDISTAN REGIONAL GOVERNMENT
COUNCIL OF MINISTERS
MINISTRY OF Labor and Social Affairs

أقليم كوردستان-العراق
مجلس الوزراء
وزارة العمل والشؤون الاجتماعية
مكتب الوزير

هاوپێچی ژمارە ١٥

ژمارە : ٤٢٥
ڕێکەوت : ٢٠٢٠/٦/١٥
٢٧١٩ کوردی
No :
Date :

بۆ/ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران / سەرۆکایەتی دیوان

بابەت/ ناردنی پرۆپۆزەل

هاوپێچ لەگەڵ نووسراوماندا پرۆپۆزەلی دامەزراندنی ( مەڵبەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی- المركز التشخيصي للعوق)، دەخەینە بەردەستتان بۆ کۆبوونەوەی داهاتووی لێژنەی باڵا.

لەگەڵ ڕێزدا...

هاوپێچ:

- پرۆپۆزەلی مەڵبەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی

کوێستان محمد عبدالله
وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی

وێنەیەك بۆ :

- وەزارەتی دارایی و ئابوری. نووسینگەی جەنابی وەزیر
- وەزارەتی تەندروستی .نووسینگەی جەنابی وەزیر.
- فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون. نووسینگەی سەرۆکی فەرمانگە
- نووسینگەی بەڕێز جەنابی وەزیر.
- نووسینگەی بریکاری وەزارەت.
- بەڕێوەبەری گشتی دیوان.
- دۆسیەی دەرکردە. لەگەڵ بەراید

Dr.hogr

هەرێمی کوردستان – عێراق
ئەنجوومەنی وەزیران
وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی

أقليم كوردستان – العراق
مجلس الوزراء
وزارة العمل والشؤون الاجتماعية

# دامەزراندنی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی

# (مركز تشخيص العوق)



ئامادەکردنی/ وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی

پوشپەڕ (حزيران) ٢٠٢٠

پێکهاتەکان

## ١. پێشەکی

پرۆسەی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی لەهەر وڵاتێکی دونیادا لەرێگای پێشکەش کردنی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکانەوە بەدی دەکرێت. بەڵام پێویستە خزمەتگوزارییەکانیش لەگەڵ ئاستی تێگەیشتن و وشیاری تاکەکانی کومەڵگادا بگونجێن و تەواوکەری یەکتر بن. بۆ ئەم مەبەستەش وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی کەیەکێکە لەوەزارەتەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بەیاسای ژمارە ٣٤ی ساڵی ٢٠٠٤ لەپەرلەمانی کوردستان دامەزراوە. ئەم وەزارەتە لایەنێکی گەورەو گرنگی کاری حکومەت و کۆمەڵگایە بۆ بەرنامە دانان و بەزانستی بەرجەستە کردنی هەموو ئەو تیۆرە کۆمەڵایەتی و ئابووری و خزمەتگوزاریانەی کەهۆکارن بۆ بەرەو پێش بردن و گۆڕینی ژیانی کۆمەڵگا و خۆشگوزەرانی زیاتر و سەردەمیانە بۆ دابینکردن و پێشکەشکردنی خزمەتگوزرایە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان. هەروەها کارکردن لەگەڵ هەموو ئەو بوارانەی کەپەیوەندیان بەژیانی تاك و کۆمەڵ هەیە لەلایەنی کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئابووری و هۆشیاری و تەندروستی و پەروەردەو فێرکردندا.

پشت بەست بە یاسای چاوێری کۆمەلایەتی ژمارە (١٢٦) ی ساڵی ١٩٨٠ بابەتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی بۆ خێزانی هەژار و کەمدەرامەت, مندڵان, خاوەن پێداویستی تایبەت (جەستەیی, دواکەوتی مێشك و دەرۆنی) پێویستە هاوکاری بکرێن لە بەردەوامبوون ژیان و تێکلاوی کۆمەڵگا لە رێگای شیاندن و بەشداری پێکردنیان لە کرداری بەرهەمعێنان و وەبەرهێنان بەو توانایەی کە هەیانە.

لەم راپۆرتەدا هەنگاوەکانی حکومەتی هەرێم و وەزارەتمان لە جێبەجێکرنی یاسای چاکسازی ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ تایبەت بە مووچەو دەرماڵە و پەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان ئەوەی کە پەیوەندی بە وەزارەتمانەوە هەیە لە دامەزراندی ناوەندی دەسنیشانکردنی پەکەوتەیی (مرکز تشخیص العوق) بە بایەخەوە بخرێتە روو کە دەبێتە تاکە دامەزراوەی تایبەتمەند بە دیاریکردنی رێژەیی پەککەوتەیی و کەمئەندامی بە پێی پێوەری جیهانیە کارپێکراوەکان .

وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی رێنمایی و رێوشوێنی پێویستی بۆ دامەزراندنی ناوەند جێبەجێ دەکات..

ناوەندی دەستنیشانکردی پەککەوتەیی یەکێکە لە پرۆژە گرنگەکانی وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی بۆ دیاریکردنی ڕێژەیی پەککەوتەیی و کەمئەندامی ئاماژە بە بریاری ژمارە (١٢٧) لە ٢٠١٧/١٢/٥ و ژمارە (٥٤٣٣) لە ٢٠١٧/١٢/١٤ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران کە سەر بە وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی دەبێت کە لە لێژنەیەك پێك دێت بە نوێنەری هەریەك لەمانەی خوارەوە:

| | | |
|---|---|---|
| ١ | بەڕێوەبەی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی | سەرۆك |
| ٢ | دکتۆری پسپۆری جومگە | ئەندام |
| ٣ | دکتۆری پسپۆری ئێسك و بڕبڕەی پشت | ئەندام |
| ٤ | دکتۆری پسپۆری دەمار و ریشاڵ | ئەندام |
| ٥ | دکتۆری پسپۆری منداڵ | ئەندام |
| ٦ | دکتۆری پسپۆری هەناو | ئەندام |
| ٧ | دکتۆری پسپۆری چاو | ئەندام |
| ٨ | دکتۆری پسپۆری لەت و گوێ | ئەندام |
| ٩ | دکتۆری پسپۆری تیشك و سۆنار | ئەندام |
| ١٠ | (٢) توێژەری کۆمەلایەتی | ئەندام |
| ١١ | (٢) توێژەری دەرونی | ئەندام |

## ٢. پەیکەری کارگێری پێشنیارکراو بۆ ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی:

بەمەبەستی ئاسانکاری بۆ هاولاتیان پەیکەری کارگێری ناوەند بەم شێوەیە دابەشکراوە:




وەهەروەها میلاکی پێشنیارکراو بەپێ ی پلەو ئاستی خوێندن و ڕەگەزەکانیان لە (٤٤) فەرمانبەر پێك دێت کە بە سەر بەش و هۆبەکان دابەش کراوە.

### خشتەی ژمارە (١)

| دکتۆرا | | ماستەر | | دبلۆم بالا | | بکالۆریۆس | | دبلۆم | | ئامادەیی پیشەسازی | | ئامادەیی | | دواناوەندی | | سەرەتایی | | کەمتر لە سەرەتایی | | تەواوی | | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ٠ | ٠ | ١ | ١ | ٠ | ٠ | ١٥ | ١٠ | ٥ | ٤ | ١ | ٠ | ١ | ٠ | ٠ | ١ | ٢ | ١ | ١ | ١ | ٢٦ | ١٨ | ٤٤ |

## ٢. ئامانج لە دامەزراندنی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی

**دیدگە (الرؤیة):**

ئامانجی ناوەند پێشوازی و دەشتنیشانکردن و جیاکردنەوە پەککەوتەیی بەپێی سروشتی پەککەوتەیی

**پەیام (الرسالة):**

"ئەم ناوەندە دادەمەزرێت بۆ دەستنیشانکردنی ڕێژەی پەککەوتەیی و جیاکردنەوەیان بە پێی سروشتی پەککەوتەیی (جەستەیی، بینین، بیستن، مێشك) بە شێوەیەکی ڕێك و پێك وبەرزکردنەوەی ئاستی خزمەتگوزاری بۆ خاوەن پێداویستی تایبەت و تۆمارکردنی ئەلیکترۆنی بۆ کەمکردنەوەی کێشەی ناشایستە و دووبارە لەسەر ئاستی هەرێم، لەلایەکی دیکەشەوە بۆ کەمکردنەوەی بارگرانی لەسەر شانی گەنجینەی دەوڵەت و کارکردن لە سەر جێبەجێ یاسای چاکسازی و کارنامەی حکومەتی هەرێمی کوردستان".

**ئامانج (الهدف)/**

- **پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ خاوەن پێداویشتی تایبەت.**
- **جێگیرکردنی مافەکان و دابینکردنی ژیانێکی شایستە خاوەن پێداویشتی تایبەت.**
- **دەستنیشانکردی ڕێژەی پەککەوتەیی.**
- **ئاشکراکردنی توانا و لێهاتووی جەستەیی خاوەن پێداویشتی تایبەت.**



### ٤. ئەرك و دەسەڵاتەكان

- پابەندبوون بە یاسا و ڕێنمایەکانی تایبەت بە ناوەند.
- سەرپەرشتی کردنی کارەکانی ناوەند و دانانی بنچینەکانی دەستنیشانکردنی ڕێژەی پەککەوتەیی.
- تۆمارکردنی هەموو زانیاریەکان لە سیستەمێکی ئەلیکترۆنی.
- دەرکردنی ناسنامەی تایبەت بە پەککەوتەیی.

### ئامرازی (SWOT)

لە قۆناغی ئیستادا هەنگاوی یەکەم بۆ دامەزراندنی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی بەکارهێنانی ئامرازەکانی هەڵسەنگاندن (SWOT)ە، وەزارەتمان دەتوانێت خالی بەهێز و لاواز و دەرفەت و ئاستەنگەکان بزانێت بۆ بەدەستخستنی ستراتیژی کارکردن کە کار دەکات لە بەرجەستەکردنی گشت ئامانجەکان.



## خالی بەهێز :

١. هەبوونی یاسای چاوێری کۆمەلایەتی ژمارە (١٢٦) ی سالی ١٩٨٠.
٢. دەرکردنی بریاری ژمارە (١٢٧) لە ٢٠١٧/١٢/٥ و ژمارە (٥٤٣٣) لە ٢٠١٧/١٢/١٤ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران.
٣. هەبوونی پالپشتی یاسای چاکسازی ژمارە (٢)ی سالی ٢٠٢٠ تایبەت بە مووچەو دەرماڵە و پەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان.
٤. پالپشتی کردن و گرنگیدانی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران و وەزارەتمان بۆ دامەزراندنی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی .

## خالی لاواز :

١. نەبوونی فەرمانبەری تایبەتمەندی (اختصاص) پێویست لە بواری توێژەری کۆمەلایەتی و دەرونی و ژمێریاری و وردبینی.
٢. نەبوونی بالەخانەی گونجاو بە ناوەند.
٣. نەبوونی ئامێر و کەل و پەل و پێداویستی پزیشکی تایبەت بە ناوەند.
٤. نەبونی رێنمای تایبەت بە ناوەند.

## دەرفەتەکان :

١. نەهێشتی سوودمەندبوون لە جارێك.
٢. بەرجەستەکردنی مافەکانی خاوەن پێداویستی تایبەت لە گشت دام دەزگاکان.
٣. ناساندنی خاوەن پێداویستی تایبەت بە گشت دام و دەزگاکان.
٤. ئاشکراکردنی توانا و لێهاتووی جەستەیی خاوەن پێداویشتی تایبەت.

## ئاستەنگەکان :

١. ئاستەنگی دارایی لە دروستکردنی بالەخانەی گونجاو.
٢. نەبوونی شارەزایی لە بەرێوەبردن بەهۆی نەبوونی ناوەندی هاوشێوە لە رابردوو.
٣. ناسەقامگیریی سیاسی و کۆمەلایەتی.

## ٥. گۆڕینی S W O T بۆ پلانێکی جێبەجێکراو

١ هەڵسەنگاندنی خاڵی بەهێز و خاڵی لاواز بە شێوەییەکی وەرزی.

٢- رەخساندنی دەرفەتی زیاتر بۆ زاڵ بوون بەسەر ئاستەنگەکان.

٣- دانانی چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکان.

٤- هەوڵدان بۆ گۆڕینی خاڵی لاواز بە خاڵی بەهێز .

٥- ئەو خاڵە لاوازانەی کە ناتوانرێت بۆ خاڵی بەهێز بگۆردرێت ئەوە بەخاڵی پەکخستن یاخوود کەمتەرخەم ئەژماردەکرێت، لەو کاتە هەوڵ دەدرێت بۆ کەمکردنەوەی بۆ نزمترین ڕێژە ئەگەر بەرچاو بوو .

## ٦. هەڵبژاردە و شیکاری هەڵبژاردەکان

بۆ بڕیاردان لەسەر دامەزراندنی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی پێویستە پشت ببەسترێت بە ستراتیژی وردبینی لە شیکار کردنی داتا و زانیاریەکان بەشێوەیەکی راست و دروست لە رێگای هەڵسەنگاندنی هەڵبژاردەکان (Options) بۆ گەیاندنی ئەم پرۆژەییە بە باشترین و بەرزترین ئاست لە رووی جۆریەتیەوە (Quality) بۆیە پێویستە دڵنیا بین لە میکانیزم و یاسا و رێنمایەکانی ئەم ناوەندە کە گونجاوە بۆ بەرەو پێشچوون و سەرخستن.

بە پێی ئاماژەکانی سێ جۆر لە پێوانە هەن بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵبژاردەکان ئەوانیش (گونجان، پەسەند، کەڵك). گشت ستراتیجەکانیش لایەنی داریکراوی باش و خراپیان هەیە، هەڵبژاردەکانی خوارەوە دیدگای راست و دروستمان نیشان دەدات بۆ هەڵبژاردنی باشترین ستراتیجی.

## ١. هەڵبژاردەی یەکەم / بەردەوام بوون لەسەر شێوازی کارکردنی پێشوو.

ئەم هەڵبژاردەیە ئەوە دەگەیەنێت بەردەوام بوونە لەسەر رێنمایی و پەیرەوەی کە بۆ دەستنیشانکرنی پەککەوتەیی دانراوە لە رێگای لێژنە پزیشکیەکانی پشکنینی وەزارەتی تەندروستی لە کاتی ئیستادا وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەلایەتی پشتی پێدەبەستێ و کاری لەسەر دەکات بە رەچاوکردنی بارودۆخی ئابووری هەنوکەیی هەرێم ، لەگەڵ هەبوونی کۆمەڵێك کێشەو گرفت لە میکانیزمی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی ئەم پرۆسەیە لە سەرتاوە بەڵام لەکاتی ئیستادا پێویستە بەدواداچوون و پێداچوونەوەی زیاد بکرێت لە رێگای هاوبەشی پێکردنی زیاتری توێژەری دەروونی و کۆمەلایەتی لە لێژنەکان، هەربۆیە زیادکردنی بەدواداچوون و پێداچوونەوە بۆ پشکنینەکان و دۆسیەکان دەبێتە هۆی هەنگاونان بۆ کەمکردنەوەیی ناشایستەیی و باشترکردنی چۆنیەتی پشکنین. لایەنی باش و خراپەکانی ئەم پرۆژەیە لە خشتەی ژمارە (١٣) ئاماژەی پێکراوە:.

خشتەی ژمارە (٢)

| لایەنە باشەکان | لایەنە خراپەکان |
|---|---|
| هەبوونی لێژنەی پشکنین سوودمەندان لە زۆربەی شار و قەزاکان | نەبونی هەماهەنگی پێویست لە نێوان وەزارەتی کار و تەندروستی |
| ئەنجام دانی بەدواداچوون و پێداچوونەوە پێویستی بە تێچوو و کاتیکی کەمترە | زۆرێك لە پشکنینەکان بە شێوەیەکی رێك و پێك ئەنجام نادرێن بەهۆی کەمی ئامرازی پشکنین |
| ئاسانی لە بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر سوودمەندان | بەهۆی پەرش و بلاوی لێژنەکان جۆرێك لە کاریگەری کاتێکردن دەبێت لە دەستنیشانکردن |
| هەبوونی لامەرکەزیەت لە دەستنیشانکردن | هەبوونی شایستەبوون لە جارێك |

## ٢. هەڵبژاردەی دووەم/ دامەزراندنی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی.

وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەلایەتی بە هەماهەنگی و پاڵپشتی لەگەڵ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران پلانی دارشتووە بۆ دروستکردنی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی، پێشبینی دەکرێت کە ئەم ناوەندە هاوکار بێت بۆ دیاریکردنی رێژەیی پەککەوتەیی و کەمئەندامی بە پێی پێوەری جیهانیە کارپێکراوەکان.

هەروەها پرۆژەی دروستکردنی ناوەند توانا زانستی پزیشکی دەخاتەروو کە هاوکارن لەسەرخستنی پرۆژەکەدا و ئەو زانست و لێهاتووییانەی کە پێویستن بۆ بەتواناکردن و باشترکردنی دەستنیشانکردن لەبەر رۆشنایی  توانای زانستی ناوەند.

هەروەکو بە شێوەیەکی روون وا دەردەکەوێت کەوا ئەنجام دانی ئەم پرۆژەیە یەکسانی کۆمەلایەتی و پاراستنی ماف خاوەن پێداویستی تایبەت. وەدەتوانرێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەوا ئەم ناوەندە دەبێتە هۆی **پێشکەشکردنی باشترین خزمەتگوزاری بۆ خاوەن پێداویشتی تایبەت و جێگیرکردنی مافەکان.** لایەنی باش و خراپەکانی ئەم پرۆیە لە خشتەی خوارەوە ئاماژەی پێکراوە:.

خشتەی ژمارە (٣)

| لایەنە باشەکان | لایەنە خراپەکان |
|---|---|
| هەبوونی ناوەندێکی نیشتمانی لەسەر ئاستی هەرێم | ئەنجامدانی پرۆژە تێچووی زۆری پێویستە لەم بارە ئابووریە نالەبارە |
| یارمەتی دەرە بۆ کەم کردنەوەی ناشایستەیی لە دەستنیشانکردن | دروست بوونی نارەزایی سوودمەندانی ناشایستە |
| ئاسانی لە بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر سودمەندان | نەبوونی شارەزایی لە بەرێوەبردنی ناوەند |
| کەمکردنەوەی بارگرانی دارایی بە کەمکردنەوەی ژمارەی سوودمەندان و دەرهێنانی ناشایستە | ئاستەنگی گەیشتنی سوودمەندان بە ناوەند بەهۆی بوونی یەك ناوەند تەنها لە شاری هەولێر |

ئامانج لە خستنە ڕووی ئەم ستراتیژە درخستنی گرنگی هەبوونی و سەلماندنی ئەوەی کە ئایا ئەم ناوەندە دەبێتە هۆی پێشکەشکردنی باشترین خزمەتگوزاری بۆ خاوەن پێداویشتی تایبەت و جێگیرکردنی مافەکان, بە سەرنج دانی خشتەکانی ژمارە (٢– ٣) وا دەردەکەوێت کەوا هەڵبژاردەو شیکاری هەڵبژاردەکان دەبێتە هۆکار بۆ زیادکرنی توانستی زانستی و ئەکادیمی و پیشەیی لەسەر بنەمایی جیاوازی لایەنی (باش و خراپ)

لە کۆتایی راپۆرتەکەدا دوای دیراسە و هەڵسەنگاندن بۆ هەردوو هەڵبژاردە بە گرنگ و پێویست دەزانین لەگەڵ جێبەجێ کردنی **پرۆژەی دروستکردنی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی** کە چاوەڕواندەکرێت کاریگەری و دەرئەنجامەکانی بەك شێوەیەی خوارەوە دەبێت:.

١. **پێشکەشکردنی باشترین خزمەتگوزاری بۆ خاوەن پێداویشتی تایبەت.**
٢. **جێگیرکردنی مافەکانی خاوەن پێداویشتی تایبەت.**
٣. ئاشکراکردنی توانا و لێهاتووی جەستەیی **خاوەن پێداویشتی تایبەت.**
٤. کەمکردنەوە یاخود نەهێشتنی ناشایستەیی.
٥. هەبوونی داتاو زانیاری دروست.
٦. کەم کردنەوەی ئەرکی سەرشانی حکومەت.

## ٧. کۆتایی

لە پوختەی راپۆرتەکە ئەوە بە روونی دەردەکەوێت کە ***(ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی)*** دەبێتە دەستکەوتێکی باش بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان و شایستەی هەموو هەوڵ و کۆششێکە بۆ دامەزراندنی بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی ناوەند بە گشتی. لەگەڵ ئەوشدا دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی بری تێچوو و کات و ڕەزامەندی هەولاتیان, لە رابردوو و کاتی ئیستادا ئەم پرۆسەیی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی ڕووبەڕووی زۆرێك لە کێشەو گڵەیی بووەوە لە ڕووی ناشایستەیی و سوودمەندبوونی زیاتر لە جارێك. بۆیە بریاردان لە لایەن حکومەتی هەرێمەوە بۆ دامەزراندنی ناوەن و پاڵپشتی و یارمەتیدانە بۆ بەتوانابوون لە دەستنیشانکردن ی پەککەوتەیی و داڕشتنی ئامانجەکاندا بەشێوەیەکی ڕاست و دروست.

## ٨. پێشنیارەکان

- دروستکردنی هەماهەنگی لەگەڵ ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی لە بەغدا بە مەبەستی بەدەست هێنانی شارەزایی.
- هەماهەنگی کردن لەگەل وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەمەبەستی دابینکردنی دەکتۆری پسپۆر بە پێی پێویستی ناوەند.
- هەموارکردنەوەی یاسایی کەمئەندامان و خاوەن پێداویستی تایبەت.
- پرکردنەوەی میلاك (دامەزراندن , گرێبەست, تەنسیب).
- بڕینەوەی دەرمالەی تایبەت یاخود هاوتا کردنی دەرماله لەگەڵ فەرمانگەکەمان وەزارەتی تەندروستی لەبەر هەمان کار ئەنجام دەدەین.
- دابینکردنی بوودجەی پێویست و پێشنەی بەردەوام.
- پێدانی بالەخانەی گونجاو پێشنیاری باڵەخانەی (نەخۆشخانەی هەوار یاخود بەشێك لە باڵەخانەی نەخۆشخانەی پەپوڵە).

## ٩. پێداویستییەکان و دەرخستەی پێویست بۆ دامەزراندنی ناوەند

**یەکەم: پێداویستییەکان:**

دامەزراندنی ئەم ناوەندە پێویستی بەمانەی خوارەوە دەبێت:

١. ڕەزامەندی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران لەسەر دامەزراندنی ناوەند.

٢. سەردانیکردنی ناوەندی دەستنیشانکردنی پەککەوتەیی لە بەغدا یان هاوشێوەی لە ولاتان بەمەبەستی وەرگرتنی زانیاری و شارەزایی.

٣. دابینکردنی پیداویستییەکانی دروستکردنی کە لە خوارەوە ئاماژەی پێکراوە وەکو پێداوستی میلاك و بودجە و هونەری و هتد....

بۆ دامەزراندنی ئەم ناوەندە لە رووی کارگێری و داراییەوە و هونەریـەوە ئـەم دەرخسـتـەی خوارەوەمـان پێویست دەبێت:

(پێداویستی ناوەند لە رووی میلاك)

| دکتۆرا | | ماستەر | | دبلۆم باڵا | | بکالۆریۆس | | دبلۆم | | ئامادەیی پیشەسازی | | ئامادەیی | | دواناوەندی | | سەرەتایی | | کەمتر لە سەرەتایی | | تەواوی | | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | |
| ٠ | ٠ | ١ | ١ | ٠ | ٠ | ١٤ | ١٠ | ٥ | ٤ | ١ | ٠ | ١ | ٠ | ٠ | ١ | ٢ | ١ | ١ | ١ | ٢٦ | ١٨ | ٤٤ |

بەهۆی ئەوەی ناوەند لە سەرتاسەری هەرێم خزمەتگوزاریەکان پێشکەش بە هاولاتیان دەکات پێویستیمان بە پلە فەرمانبەریانەی خوارەوە دەبیت بە شێوەی دامەزراندنی هەمیشەی یان گرێبەست یاخود گواستنەوەی راژە لەو فەرمانگانەی کە فەرمانبەریان زیادە.

(پێداویستی ناوەند لە رووی دارایی)

- لە رووی داراییەوە لە کاتی دەستپێکردنی کارەکانی ناوەند پێوبیستە بوودجەی پێویست و پێشینەی مانگانە تەرخان بکرێت.
- پاڵپشتی دارایی بۆ دروستکردنی سیستمێکی ئەلیکترۆنی گونجاو.
- پاڵپشتی دارایی بۆ راهێنانی کارمەندان.

هەرێمی کوردستان - عێراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
سەرۆکایەتی دیوان
فەرمانگەی کاروباری کارگێری و دارایی
بەڕێوەبەرایەتی کارگێری

Kurdistan Regional Government
Council of Ministers

إقليم كوردستان - العراق
رئاسة مجلس الوزراء
رئاسة الديوان
دائرة الشؤون الادارية و المالية
مديرية الادارة

ژمارە: ٥٤٢٥
ڕێکەوت: ٧ / ڕەزبەر / ٢٧٢٠ ی کوردی

٢٠٢٠/٩/٢٩

هاوپێچی ژمارە ١٦

بۆ / وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی
بابەت / وەڵام

ئاماژە بە نووسراوتان ژمارە (١٩٠) لە ٢٠١٩/١٠/٢٩
ڕەزامەندی درا لەسەر کردنەوەی ناوەندی دەستنیشانکردنی کەمەندامی لە بری پەککەوتەکەی (مرکز شخصیة العوق) بە قۆناغ بەندی بە پێی توانای دارایی حکومەت بەم شێوەیەی خوارەوە :
قۆناغی یەکەم :
أ.دابین کردنی (٣) سێ قاتی خوارەوە لە باڵەخانەی وەزارەتی کشتوکاڵی پێشوو لەسەر ڕێگای کەرکوک بۆ ئەم ناوەندە.
ب.نۆژەنکردنەوەی (٣) قاتی سەرەوە لە هەمان باڵەخانە .
قۆناغی دووەم :
أ.پەسەندکردنی سەرەتایی هەیکەلیەتی ناوەندی دەستنیشانکردنی لە بری پەککەوتەیی .
ب.میلاک / ئەو فەرمانبەرانەی کە تایبەتمەندن بەو کارە لە وەزارەتتان بگوازرێنەوە بۆ ئەو ناوەندە ئەگەر میلاک پڕ نەکرایەوە ئەوا دەتوانرێت لە ڕێگای گواستنەوە و تەنسیب کردنی فەرمانبەران لە وەزارەتەکانی تر پڕکردنەوەی میلاکیان بۆ بکرێت .
قۆناغی سێیەم :
أ.بۆ دابینکردنی کەل و پەلەکانی سەنتەرەکە (اثاث + کهرەبائیات+ IT) لە دوای پێداچوونەوە بە نرخی دەرخستەکان بە پێی توانای داراییمان دابین دەکرێت .
ب.بۆ دابینکردنی ئامێر و پێداویستیە پزیشکیەکان هەوڵ بدرێت لە ڕێگەی وەزارەتی تەندروستی دابین بکرێت .

لەگەڵ ڕێزدا

د. ئومێد صباح عثمان
سەرۆکی دیوان

وێنەیەک بۆ:
- لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی / نووسراوتان ژمارە (٢٩٣٨) لە ٢٠٢٠/٤/١٦ / بۆ ئاگادارییتان/ لەگەڵ ڕێزدا.
- فەرمانگەی کاروباری کارگێری و دارایی .
- دۆسیەی گشتی .
- خولاو .

هەرێمی کوردستان/ عێراق

ئەنجومەنی وەزیران

إقليم كوردستان/ العراق

مجلس الوزراء

هاوپێچی ژمارە ١٧

# بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران

## ژمارە (٦٥) لە ٢٠٢٠/٧/٨

پشتبەست بە ئەحکامی ماددەی (هەشتەم) لە یاسای ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٩٢ هەموارکراو، و پشتبەست بە ماددەی (١٥) لە یاسای چاکسازیی ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠، و دوابەدوای هەردوو بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (١١١) لە ٢٠١٧/٥/٣٠، و بڕیاری ژمارە (٥٠) لە ٢٠٢٠/٥/٥، و لەسەر پێشنیاری بەڕێز جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، و لەبەر ڕۆشنایی کۆنووسی کۆبوونەوەی ئاسایی ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (٣٣) لە ٢٠٢٠/٧/٨، ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری دا بە:

١. پەسەندکردنی دەستپێکردنی قۆناخی دووەمی پرۆگرامی بایۆمەتری بە ئاڕاستەی بەرجەستەکردنی حکومەتی ئەلیکترۆنی بە سوودوەرگرتن لە تەکنەلۆژیای زانیاریی لە بەڕێوەبردنی دامەزراوەکانی حکومەت و فراوانکردنی پرۆگرامەکە تا بوارەکانی دیکەش بگرێتەوە و ببێتە یارمەتیدەرێکی سەرەکی بۆ جێبەجێکردنی کردارەکی چاکسازی و بە ئەلیکترۆنیکردنی دامودەزگاکانی حکومەت و هێنانەکایەی شێوازێکی نوێی چالاک بۆ حکومەت و حوکمڕانی دروست.

٢. پشتبەست بە ماددەی (١٥) لە یاسای چاکسازیی ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ کە تیایدا هاتووە نابێت هیچ کەسێك خانەنشین بکرێت یان هەر ئیمتیازاتێکی دیکەی دارایی لەژێر هیچ بیانوو و پاساوێکدا پێ بدرێت ئەگەر پێشتر بەشایستەبوونی خۆی لە تۆمارەکانی پرۆگرامی بایۆمەتری تۆمار نەکرابێت و مووچەی خانەنشینیی بۆ میراتگری یاسایی خەرج ناکرێت تاوەکو تۆمار نەکرێت لە پرۆگرامی بایۆمەتری، بۆیە بڕیار درا بە:

أ) ڕاگرتنی خانەنشینکردن ئەگەر پێشتر کەسەکە لە پرۆگرامی بایۆمەتری تۆمار نەکرابێت و بەرایی نەبێت ئەمەش دوای یەکلاییکردنەوەی ئەوانەی کە تا ئێستا خۆیان تۆمار نەکردووە.

ب) بۆ دەستنیشانکردنی کەسوکاری شایستەی شەهیدانی نوێ، پێویستە لە دوای پشتڕاستکردنەوەی شایستەبوونی یاساییان بەپێی بەڵگەی یاسایی لە چوارچێوەی یاسا بەرکارەکان ئەوکات لە پرۆگرامی بایۆمەتری تۆمار بکرێن تاوەکو شایستەی داراییان بۆ خەرج بکرێت.

ج) بەدیجیتاڵکردنی دۆسێی سەرجەم خانەنشینان پشتبەست بە تۆمارەکانی داتای پرۆگرامی بایۆمەتری.

د) بەدیجیتاڵکردنی دۆسێی سەرجەم (کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان) و زیندانی سیاسی و ئەوانەی بەپێی یاسا و پێوەرە بەرکارەکان شایستەی وەرگرتنی مافی داراییانن.

| پلە | بڕوانامە | مووچەی سویسری (المصالح الزراعیە) تا ٢٠٠٣/١٢/٣١ | مووچەی سویسری یاسای شارستانی تا ٢٠٠٣/١٢/٣١ | ساڵی تا ٢٠١٩/١٢/٣١ |
|---|---|---|---|---|
| دەیەم | بێ بڕوانامە | ١٠٣ ٠٠٠ | ١٠٣ ٠٠٠ | ٣٢٦ ٠٠٠ |
| | | ١٠٤ ٥٠٠ | ١٠٣ ٣٠٠ | ٣٣٢ ٠٠٠ |
| | | ١٠٦ ٠٠٠ | ١٠٥ ٦٠٠ | ٣٣٨ ٠٠٠ |
| نۆیەم | سەرەتایی | ١١٣ ٥٠٠ | ١٢٣ ٠٠٠ | ٣٩٨ ٠٠٠ |
| | | ١١٥ ٠٠٠ | ١٢٤ ٣٠٠ | ٤٠٤ ٠٠٠ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ناوەندی | ١١٧ ٠٠٠ | ١٢٧ ٠٠٠ | ٤٥٧ ٠٠٠ |
| هەشتەم | | ١١٨ ٥٠٠ | ١٢٨ ٣٠٠ | ٤٦٤ ٠٠٠ |
| | | | ١٢٩ ٦٠٠ | ٤٧١ ٠٠٠ |
| | ئامادەیی | ١٢٢ ٥٠٠ | ١٣٢ ٠٠٠ | ٤٧٨ ٠٠٠ |
| | | ١٢٤ ٠٠٠ | ١٣٤ ٦٠٠ | ٥٤٩ ٠٠٠ |
| حەوتەم | پەیمانگەی مامۆستایان | ١٢٥ ٥٠٠ | ١٣٧ ٢٠٠ | ٥٥٩ ٠٠٠ |
| | پەیمانگەی ەئنیئی | ١٢٥ ٥٠٠ | ١٣٩ ٨٠٠ | ٥٦٩ ٠٠٠ |
| | بکالۆریۆس | ١٣٨ ٠٠٠ | ١٤٨ ٠٠٠ | ٥٧٩ ٠٠٠ |
| شەشەم | | ١٤١ ٠٠٠ | ١٥٠ ٠٠٠ | ٥٨٩ ٠٠٠ |
| | | ١٤٤ ٠٠٠ | ١٥٣ ٢٠٠ | ٦٦٩ ٠٠٠ |
| | | ١٤٩ ٥٠٠ | ١٥٩ ٥٠٠ | ٦٩٣ ٠٠٠ |
| پێنجەم | | ١٥٣ ٥٠٠ | ١٦٢ ١٠٠ | ٧٠٥ ٠٠٠ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | ١٥٧ ٥٠٠ | ٣٠٠ ١٦٧ / ٩٠٠ ١٦٩<br>٧٠٠ ١٦٤/ | ٧١٧ ٠٠٠ |
| چوارەم | | ١٦٩ ٠٠٠ | ١٧٩ ٠٠٠ | ٨٦٠ ٠٠٠ |
| | | ١٧٤ ٥٠٠ | ١٨٢ ٩٠٠ | ٨٧٧ ٠٠٠ |
| | | ١٨٥ ٥٠٠ /١٨٠ ٠٠٠ | ١٨٦ ٨٠٠<br>١٩٠ ٧٠٠/ | ٨٩٤ ٠٠٠ |
| به بێ گۆڕینی ناونیشان و پلەی فەرمانبەری | | | | |
| سێیەم | | ١٩٩ ٠٠٠ | ٣٠٩ ٠٠٠ | ٩٤٨ ٠٠٠ |
| | | ٢٠٥ ٥٠٠ | ٢١٤ ٠٠٠ | ٩٦٨ ٠٠٠ |
| | | /٢١٢ ٠٠٠<br>٢١٨ ٥٠٠ | ٢٢٤ ٠٠٠/٢١٩ ٠٠٠<br>٢٢٩ ٠٠٠ / | ٩٨٨ ٠٠٠ |
| دووەم | | ٢٤٤ ٥٠٠ | ٢٥٤ ٥٠٠ | ١٠٤٨ ٠٠٠ |
| | | ٢٥٥ ٠٠٠ | ٢٥٩ ٧٠٠ | ١٠٦٨ ٠٠٠ |
| | | ٢٦٥ ٥٠٠ | ٢٦٤ ٩٠٠ | ١٠٨٨ ٠٠٠ |
| | | ٢٧٦ ٥٠٠<br>٢٨٦ ٥٠٠/ | ٢٧٠ ١٠٠<br>٢٧٥ ٣٠٠ / | ١١٠٨ ٠٠٠ |

اقليم كوردستان - العراق
رئاسة مجلس الوزراء
وزارة المالية والاقتصاد
مديرية المحاسبات العامة
م/ الدراسات و الابحاث و المتابعة

Kurdistan Region – Iraq
Presidency Council of Ministers
Ministry of Finance & Economy
General Directorate of Accounting

هەرێمی کوردستان - عێراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی دارایی و ئابووری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی ژمێرکاری
ب/ دیراسات و لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون

ژمارە: ٥/ ٤ / ٢٠٢٠ ڕێکەوت: / / ٢٧٢٠ کوردی ڕێکەوت: / / ٢٠٢٠ زایینی

هاوپێچی ژمارە ٣٠

# ڕێنمایی دارایی ژمارە ( ٢ )

## بۆ/ گشت وەزارەتەکان و فەرمانگەکانی نەبەستراو بە وەزارەت

## ب/ خانەنشینی

پاڵپشت به ماددەی (٧ , ٨ , ٩ , ١٠ ) له یاسای چاکسازی له مووچه و دەرماڵه و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی له هەرێمی کوردستان – عێراق وه پەیڕەوی یاسای چاکسازی ژماره (٤)ی ساڵی (٢٠٢٠) وه ئاماژه به کۆبوونەوەی لیژنەی دەرکردن و پێداچوونەوەی ڕێنمایی دارایی له ڕێکەوتی (٢٠٢٠/٦/٢١) بڕیاردرا به:-

**یەکەم/**

١- هەموو ئەو پله و ناونیشانی وەزیفی که لەخوارەوه هاتووه خانەنشین بوونیان یەک دەخرێتەوه به هەمان مەرج و پێوەرەکانی خانەنشین بوونی فەرمانبەران له پله گشتیەکانی وەزیفه له سەر میلاکی شارستانی و سەربازی هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ ,سەرۆکی هەرێم ,سەرۆکی پەرلەمان ,سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران , جێگرەکانیان ,ئەندامانی پەرلەمان وەزیرەکان و ئەوانەی به پلەی ئەوانن و بریکاری وەزارەت وئەوانەی مووچەی بریکاری وەزارەت وەردەگرن و خاوەنی پلەی تایبەتەکان و بەڕێوەبەره گشتیەکان و ئەوانەی به پلەی بەڕێوەبەری گشتی و ئەوانەی مووچەی بەڕێوەبەری گشتی وەردەگرن سەرۆک و ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگاکانی هەرێم و گشت ئەو کەسانەی که به پێ ی خشتەی کارپێکراوی مووچه له هەرێمی کوردستان , مووچه و دەرماڵەی هەردوو پلەی باڵا (أ) و (ب) وەردەگرن له سەر میلاکی شارستانی و سەربازی هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ.

٢- مووچەی خانەنشینی بۆ ئاماژه پێکراوان له خاڵی (١)ی سەرەوه هەژمار دەکرێت بەم شێوەی خوارەوه :-

أ / ڕێژەی (١٥%) پانزه له سەدا له کۆی گشتی دوا مووچه و دەرماڵەی ئەوەی له کاتی خزمەتدا وەردەگرێت.

ب/ ڕێژەی (١,٥%) یەک و نیو لە سەدا لە کۆی گشتی دوا مووچە و دەرماڵەی لە کاتی خزمەتدا وەردەگرێت.

ج / دەرماڵەی بروانامە بۆ ئاماژە پێکراوان خەرج دەکرێت کە لە برگەی یەکەم / ١,ئاماژەیان پێکراوە بەم شێوەی خواەوە :-

١- دەرماڵەی بروانامەی ئامادەیی بە ڕێژەی (١%) یەک لە سەدا لە کۆی گشتی دوا مووچە وە دەرماڵە , ئەوەی لە کاتی خزمەتدا وەری دەگرێت , دەخرێتە سەر مووچەی خانەنشین .

٢- دەرماڵەی بروانامەی دبلۆم بە ڕێژەی (٢%) دوو سەدا لە کۆی گشتی دوا مووچە وە دەرماڵە , ئەوەی لە کاتی خزمەتدا وەری دەگرێت , دەخرێتە سەر مووچەی خانەنشین.

٣- دەرماڵەی بروانامەی بکالۆریۆس بە ڕێژەی (٤%) چوارلە سەدا لە کۆی گشتی دوا مووچە وە دەرماڵە , ئەوەی لە کاتی خزمەتدا وەری دەگرێت , دەخرێتە سەر مووچەی خانەنشین.

٤- دەرماڵەی بروانامەی دبلۆمی باڵا وە ماستەر بە ڕێژەی (٦%) شەش لە سەدا لە کۆی گشتی دوا مووچە وە دەرماڵە , ئەوەی لە کاتی خزمەتدا وەری دەگرێت , دەخرێتە سەر مووچەی خانەنشین.

٥- دەرماڵەی بروانامەی دکتۆرا بە ڕێژەی (٨%) هەشت لە سەدا لە کۆی گشتی دوا مووچە وە دەرماڵە , ئەوەی لە کاتی خزمەتدا وەری دەگرێت , دەخرێتە سەر مووچەی خانەنشینی.

د / شایستەی مووچەی خانەنشینی نابێت لە ڕێژەی (٥٠%)پەنجا لە سەد تێپەر بکات لە کۆی گشتی دوا مووچە وە دەرماڵە ئەوەی لە کاتی خزمەتدا وەریدەگرێت.

__دووەم/__

١- فەرمانبەران بەو پێناسەی کە لە یاسای خانەنشینی یەکگرتووی بەرکار لە هەرێمدا هاتووە, لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە ئاماژەیان پێکراوە لە برگەی یەکەم / ١. شایستەی مووچەی خانەنشینی دەبن بە مەرجێک خزمەتی خانەنشینیان لە (١٥)پانزە ساڵ کەمتر نەبێت وەتەمەنیان لە(٤٥) ساڵ کەمتر نەبێت جگە لە حالەتەکانی مردن یان شەهید بوون یان خانەنشین بوون بە هۆکاری تەندروستی وە ئەو حاڵەتانەی کە لە یاسایی خانەنشینی بەرکاردا هاتووە بە دەرگراوە .

٢- ئەوانەی ڕاسپێردراون بە خزمەتی گشتی کە لە برگەی یەکەم /١ ئاماژەیان پێ کراوە وە مەرجەکانی هاتوو لە برگەی دووەم/١ نایانگرێتەوە ئەوا شایستەی مووچەیەکی خانەنشینی دەبن بە ڕەچاوکردنی هەمان پێوەرەكاني هاتوو لە برگەی یەکەم /٢ , بە مەرجیک لة ریژەی (٢٥%) بیست و پێنج لە سەد تێپەرنەبێت لە کۆی گشتی مووچە و دەرماڵە ئەوەی لەکاتی خزمەت وەردەگرێت, دەخرێتە سەر مووچەی خانەنشین .

٣- ئەوەی لە برگەی دووەم /٢/ هاتووە بەردەوام دەبێت تاوەکو ئەو کاتەی ئەو حاڵەتانە دەگونجێنرێت لە گەل مەرجەکانی هاتوو لە برگەی دووەم/١

٤- ئەوەی بە برگەی دووەم/٢ هاتووە ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە لە دوای بەکاربوون و جێ بە جێ کردنی یاسایی چاکسازی ژمارە (٢) وە پەیرەوی ژمارە (٤) ی ساڵی (٢٠٢٠) وە ڕێنمایی داراییەکان رادەسپێردرێت بۆ خزمەتی گشتی.

سێ یەم

١- ئەندام پەرلەمان بەئارەزوو مەندانە بۆی هەیە دەست بەرداری ماف و شایستە خانەنشین بوون بێت بۆ ئەم مەبەستە پێویستە لە ماوەیەک لە (٣٠) رۆژ تێپەر نەبێت لە ریکەوتی بەرکاربونی یاسای چاکسازی ژمارە (٢) ی سالی (٢٠٢٠) وە داوا کاریەک پێشکەش بە دیوانی سەرۆکایەتی پەرلەمانی کوردستان بکات بە مەبەستی وەرگرتنی رێکارە یاساییە پێویستەکان.

٢- ماوەی خزمەتی خولی پەرلەمانی بۆ مەبەستی سەرمووچە و بەرزکردنەوەی پلە وە خزمەتی خانەنشینی هەژمار دەکریت بۆ ئەو پەرلەمانتارەی کە دەگەرێتەوە بۆ سەر وەزیفەکەی پێشووی .

٣- حوکمەکانی برگەکانی یەکەم و دووەم و سێ یەم هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە برگەی یەکەم /١ ئاماژەیان پێکراوە وە لە پێش بەرکاربوونی یاسایی چاکسازی ژمارە (٢) ی سالی (٢٠٢٠) وە رێنمایەکانی خانەنشین بوون، پێویستە خۆیان بگونجینن لەگەڵ حکومەکانی ئەم یاسایە .

٤- ئەوانەی کە لە برگەی یەکەم /١ ئاماژەیان پێکراوە وە خزمەتی خانەنشینیان نەگەیشتۆتە (١٥) ساڵ تاوەکو ماوەی سێ ساڵ دەخرێتە سەر خزمەتەکانیان وە هاوشیوەی پلە وەزیفیە گشتیەکان بۆ ئەوەی بگەنە تەمەنی خانەنشینی سەپێنراو(ئیجباری) , بەمەرجیک لێبرینی خانەنشینی (توقیفات تقاعدیە ) ئەو ماوەیە بدات .

٥- هەڵوەشاندنەوەی دەست لە کار کێشانەوەی هەموو ئەوانەی کە لە برگەی یەکەم /١ئاماژەیان پێکراوە وەکە بە ئارەزووی خۆیان دەگەرێنەوە سەر وەزیفەی پێشویان کە پێشتر فەرمانبەری حکومەت بوون وە راژەکانیان بۆ هەژمار دەکرێت بە مەبەستی سەر مووچە وە پلە بەرزکردنەوە وە مەبەستەکانی خانەنشینی ,وە لەسەر لایەنە پەیوەندارەکان پێویستە پلەی وەزیفی و ەتەرخانکراوی دارایان بۆ دابین بکات هەروەها سەر پشک دەبن لە هەڵبژاردن وەرگرتنی مووچەی خانەنشینی یان مووچەی ئەو وەزیفەیەی کە بۆی دەگەرێتەوە.

٦- هەموو ئەوانەی کە لە برگەی یەکەم/١ ئاماژەیان پێکراوە جگە لە راسپێردراوان بە خزمەتی گشتی شایستەی مووچەی خانەنشین دەبن بە هەمان ئەو پێوەر و مەرجانەی کە لە برگەی یەکەم /٢ وە (أ,ب,ج,د) وە برگەی دووەم (١) و (٢) و (٣) (٤) , شایستەی مووچەی خانەنشینی دەبن بە رێژەیەک کە نابێت (٦٠%) تێپەر بکات لە کۆی گشتی دوا مووچە و دەرماله لە کاتی خزمەتدا وەریدەگرێت .

٧- سەرجەم دادوەران و داواکاری گشتیەکان شایستەی مووچەی خانەنشینی دەبن بە رێژەی (٧٠%) حەفتا لە سەدا تێپەر نەکات لە کۆی گشتی دوا مووچە وە دەرماڵەکانیان کە لە خزمەتی وەزیفی بە پێ ی یاسا بەرکارەکان وەریدەگرێت.

**چوارەم**

١- بەرێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی سەر بە وەزارەتی دارایی و ئابووری چەند لێژنەیەکی لاوەکی بە هاو ئاهەنگی لایەنە پەیوەندارەکانی پەرلەمان وە ئەنجومەنی دادوەری پێک دەهێنێت بە مەبەستی بە دواچوونەوە بە لیستی خانەنشینان و دڵنیابوون لە شایستەی یاسایی وە تۆمار بوونیان لە سیستەمی بایۆمەتری .

٢- ئەنجوومەنی دادوەری وە پەرلەمانی کوردستان بە مەبەستی جێ بە جێ کردنی خاڵی (١) نوێنەری خۆیان دیاری دەکەن بۆ هاو ئاهەنگی لێژنە لاوەکیەکان.

پێنجەم

١- پاڵپشت بە مادەی (٨) لە یاسایی چاکسازی ژمارە (٢) ی ساڵی (٢٠٢٠) ئەنجومەنی وەزیران گشت بەرێوەبەرایەتیەکانی خانەنشینی و فەرمانگە و یەکەی ئیداری و دارایی کە مووچەی خانەنشینیان لێ خەرج دەکرێت (شارستانی و سەربازی وە هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ وە یەکە رێک نەخراوەکانی هێزەکانی پێشمەرگە) هەڵدەوەشێنێتەوە.

٢- دوای خاڵی (١) لە سەرەوە , هەموو میلاک و موڵک و ماڵی گواستراوەی ئەو بەرێوەبەرایەتی و فەرمانگانەی کە لە خاڵی یەک ئاماژەیان پێکراوە بە هەمان بریار دەگوازرێنەوە بۆ سەر بەرێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی سەر بە وەزارەتی دارایی و ئابووری.

٣- بەرێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی سەر بە وەزارەتی دارایی و ئابووری هەیکەڵ بەندیەکی تازە بۆ ئەو بەرێوەبەرایەتیە گشتیە ئامادە دەکات / وە ئەنجومەنی وەزیران پەسندی دەکات .

٤- لە سەر وەزارەتە پەیوەندی دارەکان ( پێشمەرگە و ناوخۆ ) پێویستە لە رێگەی لێژنەی تایبەت ئەرکی پێسپاردنی هەموو دۆسیەکانی خانەنشینی شارستانی و سەربازی هێزەکانی

ئاسایشی ناوخۆ وە یەکە رێکنەخراوەکانی هێزەکانی پێشمەرگە کە لە خاڵی (١) , (٢) ەوە ئاماژەیان پێکراوە بە لیژنەیەکی تایبەت لە بەرێوەبەرتی گشتی خانەنشینی سەر بە وەزارەتی دارایی و ئابووری کە بۆ وەرگرتنی هەموو دۆسیەکان پیک بهێنریت لە ماوەیەکی کورت کە لە (٧) رۆژی تێپەر نەکات وە لێژنە لاوەکیەکان ئەرکی پێداچوونەوە لە سەر لیستی خانەنشینان بکەن وە دڵنیاببنەوە لە تۆمارکردنیان لە سیستەمی بایۆمەتری .

**شەشەم/**بەپێ ی ماددەی( ٩) لە یاسای چاکسازی ژمارە (٢) ی ساڵی (٢٠٢٠) دەبێت :-

١- هەردوو وەزارەتی دارایی و ئابووری و وەزارەتی پێشمەرگە ناوی ئەو خانەنشینانە بەرز دەکەنەوە کە بە پلەی( وەزیر, بریکاری وەزارەت, راویژکار, بەرێوەبەری گشتی) وەهەر پلەیەکی تایبەت کە دراوەتەوە ئەو پێشمەرگانەی کە لە ریزی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردستان بوون پێش رێکەوتی (١٩٩١/٣/٥) , بە مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی بریاری خانەنشین بوونیان, وە لە بری ئەوە بریاری پێویست بدرێت لە سەر چارەنووسی بریاری خانەنشین بوونیان بەپێ ی یاساکانی (٣٣) ساڵی (٢٠٠٧) وە یاسایی ژمارە (٣٤) ی ساڵی(٢٠٠٧) وە یاسایی ژمارە (٣٦) ی ساڵی (٢٠٠٤) وە بەپێ ی تایبەتمەندی .

٢- بەپێ مادەی (١٠) لە یاسای چاکسازی ژمارە (٢)ی سالی (٢٠٢٠) .

٣- وەزارەتی دارایی وئابووری و وەزارەتی پێشمەرگە ناوی سەرجەم ئەو کەسانەی کە بە نایاسایی یان پلەی وەزیفی بەرزتر لە پلەی شایستەی خۆیان خانەنشین کراون بە یان لەسەر بنەمای نایاسایی ئەژماری خزمەتی سالانی وەزیفی یان بۆ کراوە وخانەنشین کراون مەبەستی راست کردنەوەی مووچەکانیان بەرزدەکەنەوە بۆ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران لە ژێر رۆشنایی یاسا بەرکارەکان بۆ ئەو مووچەی کە بەپێ ی یاسا شایستە دەبن .

**حەفتەم**

١- گشت وەزارەتە پەیوەندارەکان و بەرێوەبەرایەتی گشتی خانەنشین سەربە وەزارەتی دارایی و ئابووری لەکاتی دروست بوونی هەر ئاستەنگێک و نارونیەک لە جێ بەجێ کردنی ئەم رێماییانە بۆیان هەیە داوای هاوئاهەنگی و رونکردنەوە بکەن لە بەرێوەبەرایەتی گشتی بوودجە لێژنەی دەرکردنی رێنمایەکان

٢- هیچ کەسێک خانەنشین ناکرێت لە ژێر هیچ ناونیشانێک ئەگەر پێشتر بە شایستە بوونی یاسایی لە تۆمارەکان داتابەیسی سیستەمی بایومەتری پەیرەوکراو لە لایەن حکومەتی هەرێمی کودستان تۆمار نەکرابێت و بەرایی نەبێت.

٣- مووچەی خانەنشینی بۆ میراتگری یاسایی (المستحق) خەرج ناکرێت تاوەکو تۆمار نەکرێت لە داتا بەیسی سیستەمی بایومیتری لە هەرێمی کوردستان.

**هەشتەم**

١- حوكمەكانی یاسایی چاك سازی ژمارە (٢) ی ساڵی ٢٠٢٠ بەمەبەستی خانەنشینی هەموو حاڵەتەكانی پێش بەركاربوونی دەگرێتەوە پێویستە خۆیان بگوجێنین لە گەل ئەم یاسایە

٢- كار بەهێچ دەقیكی یاسایی یان بریارێكی ناكۆك لەگەل حوكمەكان یاسای ژمارە (٢) ی ساڵی ٢٠٢٠ ناكرێت

٣- یاسای خانەنشینی خاوەن وەزیفە بالاكانی هەرێمی كوردستان/عیراق ژمارە ٣٦ ی ساڵی ٢٠٠٤ هەلدەوەشێتەوە كار بەیاسا بەركارەكانی خانەنشین لە هەرێمی كوردستان دەكرێت.

٤- ئەم رێنمایە جێ بە جێ دەكرێت لە رێكەوتی دەرچوونی كاری پێ دەكرێت و لە رۆژنامەی وەقایعی كوردستانی بلاو دەكرێتەوە بۆ ئاگاداریتان و كار پێ كردنی .. لەگەڵ رێزدا

**ئاوات جەناب نوری**

**وەزیری دارایی و ئابووری**

**وێنەیەك بۆ/**

- سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا .
- پەرلەمانی كوردستان - عێراق .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا .
- سەرۆكایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ سەرۆكایەتی دیوان/ ف ـ ك ـ كارگێری و دارایی/بۆ ئاگاداریتان ...لەگەڵ رێزدا .
- وەزارەتی داد / بەڕێوەبەرایەتی رۆژنامەی وەقایعی كوردستان / بۆ ئاگاداریتان و بڵاوكردنەوەی ... لەگەڵ رێزدا.
- ئەنجوومەنی دادوەری .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا .
- دیوانی چاودێری دارایی هەرێمی كوردستان .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا .
- فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا .
- دەستەی دەسپاكی .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا .
- كۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن و راپرسی .. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا .
- نووسینگەی بەڕێز وەزیری دارایی و ئابووری / بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا .
- نووسینگەی بەڕێز بریكاری وەزارەت بەوەكالەت/ بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا.
- دەستەی راوێژكاران لە دیوانی وەزارەتمان.. بۆ ئاگاداریتان ... لەگەڵ رێزدا .
- گشت بەڕێوەبەرایەتیە گشتیەكانی سەر بە وەزارەتمان / بۆ گشتاندنی ... لەگەڵ رێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان/ ب ـ چاودێری و پشكنینی دارایی .. بۆ ئاگاداریتان و كاری پێویست ... لەگەڵ رێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان/ ب ـ راگەیاندن و پەیوەندییەكان .. بۆ ئاگاداریتان و كاری پێویست ... لەگەڵ رێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی گەنجینەی هەرێم/ هەولێر/ (او٢)ی سلێمانی/ دهۆك/ هەڵەبجە/ گەرمیان/ سۆران/ راپەرین/ ئاكرێ/ كۆیە/ زاخۆ/ چەمچەماڵ/ ئامێدی / بۆ زانین و كاری پێویست .
- گشت بەڕێوەبەرایەتی و بەش و هۆبەكانی بەڕێوەبەرایەتی گشتیمان .
- بەڕێوەبەرایەتی / دیراسات و لێكۆڵینەوە و بەدواداچوون .
- دۆسیەی سوڕاو .

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

| هەرێمی كوردستان – عێراق | | إقليم كوردستان- العراق |
|---|---|---|
| ئه نجومەنی وەزیران | Kurdistan Region | مجلس الوزراء |
| وەزارەتـی پـێـشـمـەرگـە | Consul of ministries | وزارة الـبـيـشـمـرگـه |
| نوسینگەی تایبەت | Ministry of Peshmarga | المكتب الخاص |
| | General Secretary | |

وەزارەتی پێشمەرگە (( دەرچوو )) بەروار / / ٢٠١

ژمارە : أ / ٣ / ٧٤٠٢

بەروار : ٨ / ٩ / ٢٠٢٠

هاوپێچی ژمارە ٣١

**بۆ / بەڕێزان/ فەرماندەیی هێزەكانی ٧٠**

**فەرماندەیی هێزەكانی ٨٠**

**بابەت / ڕێكخستن و گواستنەوەی دۆسیە و لیستی موچەی مانگانەی ئەفسەرا ن و پلەدارانی خانەنشین بەهەموو جۆرەكانیان و شەهیدان و كۆچ كردوان و كەم ئەندامان**

لەسەر رۆشنایی نوسراوی فەرمی فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون ژمارە (٢) لەرۆژی ٢٢ / ٧ / ٢٠٢٠و بەمەبەستی جێ بەجێ كردنی ماددەكانی یاسای چاكسازی ژمارە(٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ی پەیوەست بە گواستنەوەی گشت دۆسیە و لیستەكانی موچەی مانگانەی شەهیدان و كۆچ كردوان و خانەنشیان بە گشت جۆرەكانیان و كەم ئەندامان لە میلاكی وەزارەتی پێشمەرگە و هەردو فەرماندەیی هێزەكانی ٧٠ و ٨٠ بۆ سەر میلاكی وەزارەتی دارایی و ئابووری و وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالكراوان ، داواكارین :

١. لە ماوەی (١٥) پازدە رۆژ لە دوای بەرواری گەیشتنی ئەم نوسراوە ، دۆسیە و لیستەكانی موچەی شەهیدان و كۆچ كردوان و خانەنشیان بە گشت جۆرەكانیان كە لەسەر میلاكی فەرماندیەكانتان بە نوسراو ئاراستەی وەزارەتی پێشمەرگە بكرێت بەمەبەستی گواستنەوەیان بۆ سەر میلاكی وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالكراوان و وەزارەتی دارایی و ئابووری.

٢. لەماوەی (١٥) پازدە رۆژ لە دوای بەرواری گەیشتنی ئەم نوسراوە ، لیستەكانی ئەفسەران و پلەداران كەم ئەندامی پێشمەرگەی دەرچو و دەرنەچو لە فحصی پزیشكی كە بە نوسراو ئاراستەی بەرێزتان كراوە ، وردبینی بكرێت و جیابكرێتەوە لە رووی داواكارییەكان بۆ سەر لەنوێ فحص كردنی پزیشكی و ئایا هۆكاری كەم ئەندام بونیان بەهۆی ئەركی پێشمەرگەیی بووە یان نەء ، بەمەبەستی بریاردانی كۆتایی لەسەر دۆسیەكانیان و گواستنەوەی دۆسیەكانیان و لیستی موچەكانیان لە میلاكی وەزارەتی پێشمەرگە و هەردو فەرماندەیی هێزەكانی ٧٠ و ٨٠ بۆ سەر میلاكی وەزارەتی دارایی و ئابووری.

بۆ ئاگاداری زیاتر كە گشت دۆسیە و لیستەكانی موچەی شەهیدان و كۆچ كردوان و خانەنشیان بە گشت جۆرەكانیان ئەوەی لەسەر میلاكی وەزارەتی پێشمەرگە بو، بە نوسراوی فەرمی گوازرانەوە بۆ سەر میلاكی وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالكراوان و وەزارەتی دارایی و ئابووری.

**لەگەڵ ڕێزدا...**

**شۆرش ئیسماعیل**

**وەزیری پێشمەرگە**

ئەیلول/ ٢٠٢٠

**وێنەیەک بۆ :-**

- سەرۆكایەتی ئەنجومەنی وەزیران – سەرۆكایەتی دیوان / بۆ ئاگاداری لەگەڵ ڕێزدا.
- وەزارەتی دارایی و ئابووری / بۆ ئاگاداری و كاری پێویست لەگەڵ ڕێزدا.
- وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالكراوان / بۆ ئاگاداری و كاری پێویست لەگەڵ ڕێزدا.
- ئەمینداریەتی گشتی وەزارەتی پێشمەرگە / بۆ ئاگاداری و كاری پێویست لەگەڵ ڕێزدا.

دیوانی چاودێری دارایی - هەرێمی کوردستان
دیوان الرقابة المالية - اقليم كوردستان
Board of Supreme Audit
Kurdistan Region - Iraq

**هەرێمی کوردستان – عێراق**
**دیوانی چاودێری دارایی**
نووسینگەی سەرۆکی دیوان

ژمارە : ١ / ١ / ١٧٣
بەروار : ١١ / ٨ / ٢٠٢٠

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران / فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون
ژمارە: ٦٠٤
بەروار: ١٧ / ٨ / ٢٠٢٠
وەرگیرا

**بۆ/ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران / فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون**

**ب / پلانی دیوان بۆ وردبینی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی**

هاوپێچی ژمارە ٣٢

---

ئاماژە بە برگەی دووەم لە مادده (٤) و برگەی دووەم لە مادده (١١) لە یاسای ژمارە ٢ی ساڵی ٢٠٢٠ (یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشین لە هەرێمی کوردستان)، هاوپێچ وێنەیەک لە کۆنووسی لیژنەی پێکهێنراو بە فەرمانی دیوانیمان ژمارە (١٢٦/١/١) لە ٢٠٢٠/٥/١٢ تایبەت بە ئامادەکردنی پلانی دیوانیمان بۆ بەدواداچوون و وردبینی رادەی جێبەجێکردنی دەزگا حکومیەکان بۆ یاسای ئاماژە پێکراو لەسەرەوە بۆتان رەوانە دەکەین لەگەڵ وێنەیەک لە هاوپێچەکەی کە خشتەی دەستەکانی سەرۆکایەتی دیوانمان تێیدا دیاری کراوە، هەر یەک بەپێی ئەرک و شوێن و ماددەی یاسایی پێ راسپێردراو.

بۆ ئاگاداربوونی بەڕێزتان و لە کاتی هەبوونی هەر تێبینیەک تکایە ئاگادارمان بکەنەوە تاکو هیچ بۆشاییەک لە ئەرکی راسپێردراو بە دیوانمان نەمینێت.

لەگەڵ رێزدا...

<u>هاوپێچ:</u>

- ❖ کۆنووس و خشتەی پلانی دیوان (١٦ ) لاپەڕە.

**خالد هادی چاوشلی**
**سەرۆکی دیوان**
**/ ٨ / ٢٠٢٠**

<u>وێنەیەک بۆ:</u>

- ❖ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/سەرۆکایەتی دیوان/لەگەل وێنەیەک لە هاوپێچ/تکایە بۆ هەمان مەبەستی سەرەوە/لەگەڵ رێزدا.
- ❖ نووسینگەی سەرۆکی دیوان/لەگەڵ بەراییەکان.
- ❖ فەرمانگەی وردبینی (پارێزگای هەولێر، مەڵبەندی یەک، مەڵبەندی دوو) / لەگەڵ وێنەیەک لە هاوپێچ بۆ :
١- ئاگادارکردنەوەی گشت دەستەکانتان بە ناوەڕۆکی ئەم کۆنووسە. ٢- ئاراستەکردنی یاداشتێک بۆ نووسینگەمان بۆ دەرکردنی فەرمانی دیوانی بۆ هەر دەستەیەکی چاودێری هاتوو لەم پلانە لەگەڵ ئاماژە کردن بە شوێن و جۆری ئەرک و ئەو ماددەی یاساییەی کە دەستەکە راسپێردراوە بە وردبینی و بەدواداچوونی ... لەگەڵ رێزدا.
- ❖ فەرمانگەی وردبینی پارێزگای سلێمانی /نووسراوتان ژمارە (١٥) لە ٢٠٢٠/٧/١٥/ لەگەڵ وێنەیەک لە کۆنووس و نموونەی پلانەکە / بەمەبەستی ئامادەکردن و ناردنی پلانی لاوەکی فەرمانگەتان بە شێوەیەک کە گشت مادده یاساییەکان ودام دەزگاکانی دەکەونە سنووری جوگرافی فەرمانگەتان لەخۆ بگرێت تاکو بتوانین پەسەندی بکەین و کارەکانی خۆتان ئەنجام بدەن... لەگەڵ رێزدا.
- ❖ فەرمانگەی کاروباری کارگێری ودارایی و یاسایی / لەگەڵ وێنەیەک لە هاوپێچ/بۆ ئەنجامدانی کاری پێویست بە رادەی پەیوەندیتان ... لەگەڵ رێزدا.
- ❖ فەرمانگەی کاروباری هونەری و توێژینەوە / لەگەڵ وێنەیەک لە هاوپێچ/بۆ رێکخستن و ناردنی هەر تێبینی و رێنمایەکی هونەری و پیشەیی پێویست بۆ دەستەکانمان ... لەگەڵ رێزدا.
- ❖ خامەی نووسینگەی سەرۆکی دیوان

# کۆنووسی کۆبوونەوە

لێژنەی پێك هێنراو بەفەرمانی دیوانی ژمارە (١٢٦ لە ٢٠٢٠/٥/١٣) کۆبوونەوەی ئاسایی ئەنجامدا بە ئامادەبوونی سەرۆك و گشت ئەندامانی لێژنە لە سالی(٢٠٢٠)پاش گفتوگۆیەکی تێرو تەسەل لەسەر پلانی بەدواداچوونی چاودێری کردن و میکانیزمی جێ بەجێ کردنی ناوەڕۆکی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکانی خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان لە ساڵی ٢٠٢٠ لە گشت وەزارەت و دام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێم ،لێژنەکەمان ئەم پێشنیارانە دەخاتە ڕوو بەمەبەستی جێ بەجێ کردنی یاسای چاکسازی :-

١- بە پێی کۆنوسی کۆبوونەوەی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون ژمارە (٦٤)لە ٢٠٢٠/٦/٧ بڕگەی دووەم پێویستە گشت دام ودەزگاکانی حکومەتی هەرێم ئەم یاسایە جێبەجێ بکەن وەکۆتایی بە کارەکانیان بهێنن لە ٢٠٢٠/١٠/٨ وەلە دوای ئەم بەروارە دەستەکانی چاودێری دەست بەکار دەبن لەسەر گشت دام ودەزگاکانی حکومەتی هەرێم.

٢- پێك هێنانی لێژنەیەکی شارەزا لە دیوانەکەمان بەمەبەستی جێ بەجێ کردنی یاسای چاکسازی ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ لەسەر ڕۆشنایی پەیڕەوی ژمارە (٤)ی ساڵی ٢٠٢٠ کە لەسەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دەرچووە لەم بەڕێزانەی ناویان لە خوارەوە نووسراوە وەئەم لێژنەیە لە ٢٠٢٠/٧/٥ دەست بەکار دەبن.

| ژ | ناو | پایە | ئەرك |
|---|---|---|---|
| ١ | فریق سلێمان رمضان | ب. گ.ف.ك.د. یاسایی | سەرۆك دەستە |
| ٢ | نشمیل محمد زیاد | ب.توێژینەوە و هونەری و هەڵسەنگاندن | ئەندام |
| ٣ | شیرین محمود حمد | شارەزا | ئەندام |
| ٤ | طالب طاهر حمد علی | ب.سەرچاوەمرۆیەکان | ئەندام |
| ٥ | شێرکۆ عباس بایز | ب. کاروباری دارایی | ئەندام |

٣- بەپێی یاسای ئاماژە پێکراوی سەرەوە لەبەشی هەشتەم بڕگەی دووەم لە ماددەی یانزدەهەم لەم یاسایە ئاماژە بەوە دەکات کە دیوانی چاودێری دارایی هەرێمی کوردستان پابەندە بە پشکنین و ووربین کردن و بەدواداچوونی جێ بەجێ کردنی ئەحکامەکانی ئەم یاسایە و یاسا پەیوەندیدارەکانی تر بە ئامادەکردنی ڕاپۆرتی لەبەر ڕۆشنایی یاسای دیوانی چاودێری دارایی هەرێمی کوردستان /عیراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٠٨ .

٤- پێویستە لەسەر ئەو دەستە و لیژنانەی کە هەڵدەستن بە دواداچون لەسەر جێ بەجێ کردنی یاسای چاکسازی ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکانی خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان /عیراق رەچاوی ئەم یاسا و رێنمایانەی خوارەوە بکەن.

أ- یاسای چاکسازی کە لە پەرلەمانی کوردستان دەرچووە بە ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠.

ب- پەیرەوی ژمارە (٤)ی ساڵی ٢٠٢٠ کە لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دەرچووە تایبەت بە میکانیزمی جێ بەجێ کردنی یاسای چاکسازی .

ت- بریاری کۆبوونەوی ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (٢٢ لە ٢٠٢٠/٢//١٢) کە گشتێنراوە بۆ سەرجەم وەزارەت و دام و دەزگاکانی نەبەستراو بەوەزارەت بە ژمارە (٢٧٥٩ لە ٢٠٢٠/٣/٩) .

پ- یاسای خزمەتی شارستانی ژمارە (٢٤)ی ساڵی ١٩٦٠ی هەموارکراو .

ج- یاسای مووچە و دەرماڵەی فەرمانبەرانی دەوڵەت لەکەرتی گشتی ژمارە (٢٢)ی ساڵی ٢٠٠٨.

ح- بەپێی نووسراوی بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی هەرێم ژمارە (٣٥٠٠) لە (٢٠٢٠/٣/٩) ڕاژەی (جیش الشعبی) و (افواج خفیفة) و (مفارز خاصة) بە هیچ شێوەیەك بە خزمەتی فەرمانبەری ئەژمار ناکرێت بە پێی یاسای خانەنشینی ژمارە (٢٧)ی ساڵی (٢٠٠٦) لە ماددەی (٤و٥).

خ- ئەو خزمەتانەی بەپێی یاسا و ڕێنماییە داراییە پەیرەو کراوەکان ئەژمار کراوە پێویستە لێبڕینی خانەنشینیان(التوقیفات التقاعدیة) لێ وەربگیرێت بەکاش وە ڕەوانەی حسابی خانەنشینی بکرێت و ئاگاداری لایەنی پەیوەندی داربکرێت .

د- رەچاوی ئەم بڕیارەی وەزارەتی دارایی بکرێت کە پلە بەرزکردنەوەی فەرمانبەرانی ڕاگرتووە بە نوسراویان ژمارە ٤٦٥/٤/٩ لە ٢٠١٦/١/٢٤.

- سەبارەت بەو کەسانە کە شەهیدن وە یان ئەنفالکراون لێبرینی خانەنشنیان (التوقیفات التقاعدیة) دەکەوێتە ئەستۆی وەزارەتی دارایی .

- دەستەکانی چاودێری هەرسێ فەرمانگەی ووردبینی هەولێر و مەڵبەندی یەکەم و مەڵبەندی دووەم دابەش کراون بە سەر (١٩)مادە لەیاسای چاکسازی ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ کە لە پەرلەمانی کوردستان دەرچووە بەپێی تایبەتمەندی دەستەکانی چاودێری و قەبارەی کاری هەر مادەیەك لەم یاسایە وە ڕەچاوی یاسای خزمەتی شارستانی ژمارە (٢٤) بۆ ساڵی ١٩٦٠ هەموارکراو وە کار بە هیچ دەقێك ناکرێت کە پێچەوانەی یاسای چاکسازی بێت وە ئەم دەستانە دەست بەکار دەبن لە بەرواری ٢٠٢٠/١٠/٨ .
پێویستە لەسەر هەردەستەیەك ڕاپۆرتێکی ئامادەبکات لەسەر ئاستی جێبەجێکردنی گشت مادە و بڕگەکانی ئەم یاسایە.

# پلانی دیوانی چاودێری دارایی بۆ بەدواداچوونی جێبەجێ کردنی یاسای چاکسازی ژمارە ۲ی ساڵی ۲۰۲۰

| ز. ئەرك | شوێن (سەرۆکایەتیەکان ، وەزارەت و فەرمانگەکانی , دەستە سەربەخۆکان) | دەستەی چاودێری دەست نیشان کراو بۆ ئەم ئەرکە: ناو | دەستەی چاودێری دەست نیشان کراو بۆ ئەم ئەرکە: پایە | ئەرکی راسپێردراوە بە دەستەکە ( بەدواداچوونی جێبەجێ کردنی ماددەکانی دیاری کراو لە خوارەوە لە یاسای چاکسازی ژمارە ۲ی ساڵی ۲۰۰۸ئەم یاسایە) |
|---|---|---|---|---|
| ١ | - وەزارەتی دارایی و ئابووری<br>- بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشین<br>- دیوانی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان | أحرار عبدالرزاق محمد | سەرۆك دەستە | ماددەی (۷+۸+۹+۱۰+۱٥) |
| | | شیرکۆ عباس بایز | ئەندام | |
| | | سۆران محمداسماعیل | ئەندام | |
| | | طالب طاهر حمد علي | ئەندام | |
| | | نشوان محمد رسول | ئەندام | |

| ٢ | وەزارەتی دارایی و ئابووری وە گشت فەرمانگەکانی سەر بەم وەزارەتە | ماددەی(٥+٦+١٣+١٥) |
|---|---|---|

| ناو | پایە |
|---|---|
| عبدالقادر علی پیرداود | سەرۆك دەستە |
| شیروان مجیدكاك أحمد | ئەندام |
| ڕەوشت حسن وهاب | ئەندام |
| هیوا همزە ابراهیم | ئەندام |
| بیان صالح ابراهیم | ئەندام |

| ناو | پایە |
|---|---|
| هێرو برهان عبدالاحد | سەرۆك دەستە |
| ایمان جلال الدین ابراهیم | ئەندام |
| سۆران رقیب عثمان | ئەندام |
| نبیل فارس مجید | ئەندام |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٣ | - وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوان وە گشت فەرمانگەکانی سەر بەم وەزارەتە<br>- دەستەی گشتی سەربەخۆی مافی مرۆڤ | ناو | پایە | ماددەی(٢+١٥) |
| | | سلام عمر احمد | سەرۆك دەستە | |
| | | سفين عبدالستار على | ئەندام | |
| | | اردلان كوكس فرحان | ئەندام | |
| | | نزار انور جبرائيل | ئەندام | |
| ٤ | - وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوان وە گشت فەرمانگەکانی سەر بەم وەزارەتە<br>- کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | امل علي مايخان | سەرۆك دەستە | |
| | | نصرت سلطان همزه | ئەندام | |
| | | هيوا محمد حمد | ئەندام | |
| | | يونس عمرمحمد | ئەندام | |

| | | ناو | پایە | |
|---|---|---|---|---|
| ٥ | وەزارەتی پێشمەرگە وە گشت فەرمانگەکانی سەر بەم وەزارەتە | نیاز خوادا رسول | سەرۆك دەستە | ماددەی(٤+١٥) |
| | | زانا اسعد طه | ئەندام | |
| | | عمر عصمت یونس | ئەندام | |
| | | سالم غفور کریم | ئەندام | |
| ٦ | وەزارەتی ناوخۆ وە گشت فەرمانگەکانی سەر بەم وەزارەتە | گۆران محمد سلیم | سەرۆك دەستە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | خومار علي مصطفی | ئەندام | |
| | | نظام یوسف یلدا | ئەندام | |
| | | سنگر عمر حسن | ئەندام | |
| ٧ | وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی وە گشت فەرمانگەکانی سەر بەم وەزارەتە | مهاباد حسین محمد | سەرۆك دەستە | ماددەی(٣+١٥) |
| | | جمیلە عباس عبداللە | ئەندام | |
| | | سیڤان افرام متی | ئەندام | |
| | | ستار اسماعیل عثمان | ئەندام | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٨ | - وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی وە گشت فەرمانگەکانی سەر بەم وەزارەتە - وەزارەتی سامانە سروشتیەکان وە گشت فەرمانگەکانی سەر بەم وەزارەتە | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | داود سليمان مولود | سەرۆك دەستە | |
| | | ناسك اسماعيل على | ئەندام | |
| | | بالآ عمر برايم | ئەندام | |
| | | محمد فاضل احمد | ئەندام | |
| ٩ | بایۆمەتری | ناو | پایە | ماددەی(٣+١٥) |
| | | هێمن كريم سعيد | سەرۆك دەستە | |
| | | الهام اسعد محمد | ئەندام | |
| | | تابلو عمر عباس | ئەندام | |
| | | محمد نزار احمد | ئەندام | |

| | | ناو | پایە | |
|---|---|---|---|---|
| ١٠ | وەزارەتی شارەوانی و گەشت و گوزار وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | دلشاد کریم حمد | سەرۆك دەستە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | محمد احمد صابر | ئەندام | |
| | | صبريه نادرعلی | ئەندام | |
| | | سرهنگ فاضل أحمد | ئەندام | |
| ١١ | - وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە<br>- لیژنەی ئۆلۆمپی<br>- دەستەی گشتی وەبەرهێنان | سروت اسماعیل عمر | سەرۆك دەستە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | نیکار صابر عدالله | ئەندام | |
| | | شاهین رشید عثمان | ئەندام | |
| | | ئومید قادر ابراهیم | ئەندام | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٢ | - وەزارەتی تەندروستی وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | نجاة حمەصالح عزیز | سەرۆك دەستە | |
| | | سۆران عبید خضر | ئەندام | |
| | | بیریوان محمد عارف | ئەندام | |
| | | جوان فاتح مظهر | ئەندام | |
| ١٣ | وەزارەتی خوێندنی بالآ وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | هیوا امین عبدالجبار | سەرۆك دەستە | |
| | | سروان کاکل محمد | ئەندام | |
| | | سامان حسن حمد | ئەندام | |
| | | سیاکیو کاوە حسن | ئەندام | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٤ | - سەرۆکایەتی پەرلەمانی کوردستان<br>- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران<br>- دەستەی گشتی دەسپاکی | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | جمال عبدالعزیز أحمد | سەرۆك دەستە | |
| | | کامیار اکرم احمد | ئەندام | |
| | | هاوریٚ انور رمضان | ئەندام | |
| | | ریٚژین عزیز خلیل | ئەندام | |
| ١٥ | وەزارەتی ئەو قاف و کاروباری ئایینی وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | مامند یابە عمر | سەرۆك دەستە | |
| | | یاسین عولا محمد | ئەندام | |
| | | کۆسرت فؤاد خضر | ئەندام | |
| | | خاوەند کاکە احمد | ئەندام | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٦ | - سەرۆكایەتی ئەنجومەنی دادوەری<br>- دەستەی گشتی ناوچەكانی دەرەوەی هەرێم | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | شفیع شیخۆ احمد | سەرۆك دەستە | |
| | | نجاة اندراوس متي | ئەندام | |
| | | بیستون نجاة علی | ئەندام | |
| | | هێمن علي عزيز | ئەندام | |
| ١٧ | وەزارەتی پەروەردە وە گشت فەرمانگەكانی سەربەم وەزارەتە | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | وزير كمال صالح | سەرۆك دەستە | |
| | | بۆتان رشاد حسين | ئەندام | |
| | | يعقوب اسماعيل عبدالله | ئەندام | |
| | | نيوار صلاح الدين عبدالله | ئەندام | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوە ئاوییەکان وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | **ناو** | **پایە** | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | نسار محمد صابر | سەرۆك دەستە | |
| | | هەلمەت غازی عزیز | ئەندام | |
| | | علی مظفر عبدالعزیز | ئەندام | |
| | | لیلی صدیق عزیز | ئەندام | |
| ١٩ | وەزارەتی بازرگانی و پیشەسازی وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | **ناو** | **پایە** | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | نیان امام یاسین | سەرۆك دەستە | |
| | | نجاة حمدأمین حمە رشید | ئەندام | |
| | | ڤیان علی طاهر | ئەندام | |
| | | سۆزان حسن حسین | ئەندام | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢٠ | وەزارەتی داد وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | عدنان کانبی زێدان | سەرۆك دەستە | |
| | | زەردەشت خالد مصطفی | ئەندام | |
| | | عبدالله بهرام محمد | ئەندام | |
| | | ئاڵا نهرۆ یونس | ئەندام | |
| ٢١ | وەزارەتی کارەبا وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | علی حسین مصطفی | سەرۆك دەستە | |
| | | جلال یار احمد | ئەندام | |
| | | ایناس عباس عبدالله | ئەندام | |
| | | گزنگ اکرم علی | ئەندام | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢٢ | - دەستەی گشتی چاککردنەوە و پاراسنتی ژینگە<br>- دەزگای مین | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | طارق خورشید صالح | سەرۆك دەستە | |
| | | ئاوات صدیق عثمان | ئەندام | |
| | | هیوا ابراهیم ابوبکر | ئەندام | |
| | | کۆچەر عبدالله اسماعیل | ئەندام | |
| ٢٣ | وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە و نیشتەجێکردن وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | ناو | پایە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | ماجد محي الدين خليل | سەرۆك دەستە | |
| | | هاژە مامند یابە | ئەندام | |
| | | کاروان علی ابراهیم | ئەندام | |
| | | هەژار طاهرنوری | ئەندام | |
| | | هاوکار تحسین | ئەندام | |

| | | ناو | پایە | |
|---|---|---|---|---|
| ٢٤ | - وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە - ئەنجومەنی ئاسایش | ازاد نوری ابراهیم | سەرۆك دەستە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | هاودیان کاوە محمد | ئەندام | |
| | | محبت حسین احمد | ئەندام | |
| | | نوزاد مامند حمد | ئەندام | |
| ٢٥ | وەزارەتی پلان دانان وە گشت فەرمانگەکانی سەربەم وەزارەتە | سۆران جبار عبدالفتاح | سەرۆك دەستە | ماددەی(٥+٦+١٥) |
| | | شیرین محمود حمد | ئەندام | |
| | | همزە حسین شریف | ئەندام | |
| | | دلال عبدالرحمن یاسین | ئەندام | |

إقليم كوردستان – العراق
هيئة النزاهة
مكتب رئيس الهيئة

Kurdistan Region- Iraq
Commission of Integrity (KRCI)

هەرێمی کوردستان – عێراق
دەستەی دەسپاکی
نووسینگەی سەرۆکی دەستە

ژمارە: ٢/ ١٥
کوردی ٢٧٢٠
ڕێکەوت: ١٤/ ٦/ ٢٠٢٠

هاوپێچی ژمارە ٣٣

دەستەی دەسپاکی هەرێمی کوردستان – عێراق
دەرچـــوو
نووسینگەی سەرۆکی دەستە

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون
ژمارە: ٤٥٠٢
بەروار: ٢٤/ ٦/ ٢٠٢٠
وەرگیرا

# فەرمان

ئاماژە بە ماددەکانی (سێ یەم) و (پێنجەم) یەکەم - دەیەم (١و٢و٣) وە (دوازدەم) و (چواردەم) (لۆیەم) لە یاسای دەستەی دەسپاکی هەرێمی کوردستان ژمارە (٣)ی ساڵی (٢٠١١) ی هەموار کراو بە یاسای ژمارە (٧)ی ساڵی (٢٠١٤) وە پاڵپشت بە جێ بە جێ کردنی حوکمەکانی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە وبەخشین و ئیمتیازاتەکانی و خانەنیشانانی لە هەرێمی کوردستان – عیراق ژمارە (٣)ی ساڵی (٢٠٢٠), ئەنجوومەنی دەستەی دەسپاکی هەرێمی کوردستان لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ( ١٤ / ٦ /٢٠٢٠) بڕیاری دا:-

**یەکەم/** دروست کردنی تیمی کارکردن بە گوێرەی خشتەی هاوپێچ بۆ جێ بە جێ کردنی ئەو ئەرکانەی کە بەرامبەر هەر تیمێك دیاری کراوە لە چوار چێوەی بە دواداچوون و چاودێری کردنی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشینی ئیمتیازاتی خانەنیشانانی هەرێمی کوردستان , ژمارە (٣)ی ساڵی (٢٠٢٠).

**دووەم /** هەر تیمێك دیراسەی چوار چێوە یاسایی یەکەی ئەو ئەرکەی دەکات کە لەو فەرمانەدا هاتووە , بەدواداچوونی بەیانات و زانیاری و ئامارەکان دەکات بۆ بەدواداچوونی یاسای چاکسازی و ئەو لەمپەرانەی دەکەونە بەردەم جێ بە جێ کردن و دانانی پلان بۆ بە دواداچوون و چاودێری جێ بە جێ کردنی لە ماوەی (١٥) ڕۆژ دوای دەرچوونی ئەو فەرمانە.

**سێ یەم /** هەموو تیمەکان لە ژێر سەرپەرشتی و چاودێری (ژووری ئۆپراسیۆنەکان(عملیات)) کارەکانیان ئەنجام دەدەن کە دامەزراوە بۆ جێ بە جێ کردنی یاسای ژمارە (٣)ی ساڵی (٢٠٢٠) لە یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشینی و ئیمتیازاتەکان و

جمال

ناونیشان: هەولێر – شەقامی ئاراس بەرامبەری قوتابخانەی سنۆبەری بنەرەتی کچان – العنوان: اربیل- شارع اراس مقابل مدرسة صنوبر الاساسیة للبنات
Email: despaky.office@gmail.com

خانەنشینی هەرێمی کوردستان – عێراق بە سەرۆکایەتی بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی یاسایی یە و ئەندامیـــــەتی ســــەرۆك تیمەکانـــــە کــــە بـــــەو فەرمانـــــە پێکهـــــاتووە.

**چوارەم** / تیمەکان دەست بەکار دەبن بە هەماهەنگی لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان لەگەڵ دەست پێکردنی جێ بە جێ کردنی یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشینی و ئیمتیازاتـــەکان خانەنیشـــانانی هـــەرێمی کوردســـتان ژمـــارە (٣)ی ســـاڵی (٢٠٢٠).

**پێنجەم** / هەموو تیمەکان هەفتانە ڕاپۆرتی تایبەت بەکار و ئەرکەکانیان و ئەنجامەکانیان و ئەو ئاستەنگانەی دێتە بەردەمیان بەرز دەکەنەوە بۆ (ژووری ئۆپراسیۆنەکان (عملیات)) کە بەو فەرمانـــــە دامـــــەزراوە.

**شەشەم** / ژووری عملیات هەر (١٥) ڕۆژ جارێك ڕاپۆرتێك بۆ ئەنجوومەنی دەستە بەرز دەکاتەوە پوختەی کار و ئەرکەکان و پێشنیارەکانی تێدا دیاری دەکات تاکو ئەنجوومەن بڕیار لەســــەر پەســــەند کردنیـــــان بـــــدات .

**حەوتەم** / سەرۆکی هەر تیمێك ئەندامانی تیمەکەی دیاری دەکات بە هەماهەنگی لەگەڵ ســـەرۆکی دەســـتە و ســـەرۆکی ژووری عملیـــات.

**هەشتەم** / سەرۆکی دەستە فەرمانێك دەر دەکات بۆ دیاری کردنی سەرۆکی تیمەکان کە بەو فەرمانـــــە پێکهـــــاتووە .

**نۆیەم** / ئەم فەرمانە جێ بە جێ دەکرێت لە ڕۆژی دەرچوونی.

جمال

## خشتەی تیمی کار

**یەکـەم** / تیمی تایبەت بە ماف و ئیمتیازاتەکانی میراتگرانی کەس و کاری شەهیدان و ئەنفالکراوان و زیندانکراو و گیراوە سیاسیەکان,بە دواداچوون و چاودێری ئەو تەوەرانە دەکات :-

**١-** یەکخستنی ماف و ئیمتیازاتی شەهیدان و ئەنفالکراوان و بەندکراو و زیندانیانی سیاسی (ماددەی (٢))یەکەم .

٢- چاککردنەوە و هەڵوەشاندنەوەی ماف و ئیمتیازاتی میراتگران و سوودمەندان بە دەر لە یاسا بە (إستثناء) (ماددەی (٢) دووەم .

٣- چاککردنەوە و هەڵوەشاندنەوەی ئیمتیازاتی زیندانیانی سیاسی و سوودمەندان بە پێچەوانەی حوکمەکانی یاسای ژمارە (١١) ی ساڵی (٢٠١١)ی هەمووار کراو (ماددەی (٢) سێ یەم .

٤- دەرکردنی ڕێنمایی و ڕێکخستنی تێچووەکانی چارەسەر کردن و خوێندن بۆ شەهیدان و منداڵەکانی بە گوێرەی یاسای ژمارە (٩) ی ساڵی (٢٠٠٧) , (ماددەی -٢- پێنجەم) .

**دووەم** / تیمی تایبەت بە کۆتایی هێنانی سوودمەندبوونی دووبارە لە بووجەی گشتی, بە بەدواچوون و چاودێری جێ بە جێ کردنی ئەو تەوەرانە دەکات:-

١- هەڵوەشاندنەوەی پێدانی ئیمتیازاتی سوودمەندان لە چاودێری کۆمەڵایەتی و خاوەن پێداویستیە تایبەتیەکان و کەمئەندامان بە دەر لە یاسا (إستثناء)(ماددەی -٣-/یەکەم).

٢- گۆڕینی (تخصیصات)ی چاودێری کۆمەڵایەتی بە دەرماڵەی کەم ئەندامی (بەرامبەر کەم ئەندام بوون) بۆ فەرمانبەرانی کەم ئەندام (ماددەی(٣) یەکەم).

٣- هەلوەشاندنەوەی دوو مووچەیی تەنیا ئەوانە نەبێت کە بەدەر کراون لە کۆتایی. (ماددەی -

جمال

ناونیشان: هەولێر - شەقامی ئاراس بەرامبەری قوتابخانەی سنۆبەری بنەڕەتی کچان - العنوان : اربیل- شارع اراس مقابل مدرسة صنوبر الاساسیة للبنات
Email: despaky.office@gmail.com

٣-(دووەم)).

**سێ یەم** / تیمی تایبەت بە ژمێرکاری و خانەنشینی پێشمەرگە و پاسەوانان بۆ بەداداچوون و چاودێری کردنی جێ بە جێ کردنی ئەو تەوارانەی خوارەوە:-

١- یەکخستن و رێکخستنی سەرجەم ژمێرکاری یەکانی سەرجەم یەکەکانی هێزی پیشمەرگە (ماددەی٤/یەکەم).

٢- دروست کردنی دۆسیەی کەسی و پێداچوونەوەی خزمەتی پێشمەرگە (ماددەی-٤-سێ یەم).

٣- دیاری کردنی ژمارەی پاسەوانان بۆ بارەگای حزبی و بەرپرسان , دەست نیشان کرنی زیادە لەو ژمارەیە (ماددەی٤/پێنجەم).

٤- گواستنەوەی پاسەوانەکان بۆ سەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆ و هاوتا کردنی مووچەکانیان (ماددەی ٤/پێنجەم).

٥- پێداچوونەوە و رێکخستنی لیستی سوودمەندانی خانەنشینی کەم ئەندامانی پێشمەرگە بە گوێرەی یاسای ژمارە (٣٤)ی ساڵی (٢٠٠٧), وە هەڵوەشاندنەوەی (إلغاء) ئەو کەسانەی کە بە پێچەوانەی یاسا خانەنشین کراون.

٦- هەڵوەشاندنەوەی پلە بالاکانی پێشمەرگە و دەست نیشان کردنی ئیمتیازاتی دارایی لە ژێر رۆشنایی یاسایی یاسای ژمارە (٣٣)ی ساڵی (٢٠٠٧) و یاسای ژمارە (٣٤)ی ساڵی (٢٠٠٧) و یاسای ژمارە (٣٨)ی ساڵی (٢٠٠٧) بە پێ ی پسپۆڕی یەکەی (مادده (١٩)).

**چوارەم** / تیمی تایبەت بە دووبارە ئەژمار کردنی خزمەت و پلەی وەزیفی , بۆ بەدواداچوون و چاودێری لە جێ بە جێ کردنی ئەو تەوەرانەی خوارەوە:-

١- پێداچوونەوە بە رێکخستنەوەی پلە و ناوونیشان و مووچەی فەرمانبەران لەسەر بنەمای بروانامە و ساڵێنی خزمەتی فیعلی , وە لابردنی خزمەتی هەژمارکراوی نا یاسایی (ماددەی (٥)-یەکەم).

جمال

٢- یەکخستنی ناوونیشان و پلەی وەزیفی لەگەل مووچەکەی وە هەڵوەشاندنەوەی ناوونیشان و پلەی وەزیفی هاودژ لەگەل یاسا, (ماددەی (٦)/ دووەم).

٣- هەڵوەشاندنەوەی پلە و مەرتەبەی زیادە کە بە شێوەی إستثناء بە فەرمانبەر دراوە (ماددەی -٦- سێ یەم).

٤- هەڵوەشاندنەوەی سالێنی خزمەتی ئەو کاتەی کە قوتابی بووە تەنیا ئەگەر مۆڵەتی خوێندنی هەبوو بێت یان خوێندنەکەی ئێوارە بوو بێت وە هەروەها ئەوانەی کە تەمەنیان لە خوار (١٦) ساڵە جگە لە بەند کراو و زیندانیە سیاسیەکان نەبێ (ماددەی -٦-چوارەم).

٥- دووبارە رێکخستنەوەی پلە و ناوونیشان و مووچە و شایستەی پۆستە نوێ یەکان (المستحدثه) پاڵپشت بە بریاری کارگێری (ماددەی-٦- پێنجەم).

**پێنجەم** / تیمی تایبەت بە خانەنشین , بۆ بەدواداچوون و چاودێری کردن و جێ بە جێ کردنی ئەو تەوەرانەی خوارەوە:-

١- یەکخستنەوەی خانەنشینی پلە باڵاکانی دەوڵەت بە گوێرەی ماددەی (٧).

٢- گواستنەوە و یەکخستنی ئەو بەڕێوەبەرایەتیانەی کە مووچەی خانەنشینی خەرج دەکەن وە گواستنەوەی سەرجەم میلاك و أموال و دۆسیەکان بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشین و دارشتنەوەی پەیکەری رێکخستن (ماددەی (٨)).

٣- هەڵوەشاندنەوەی خانەنشینی نا یاسایی , وە چاککردنەوەی ئەوانەی کە بە پلەی بەرزتر لەو پلەی هەیان بووە خانەنشین کراون , یان لە رێگای هەژمار کردنی نایاسایی بۆ سالێنی خزمەتیان وە چاککردنەوەی بارودۆخیان (ماددەی (١٠)) .

٤- دەستەبەر کردنی تۆمار کردن لە سیستەمی بایۆمتری بۆ سەرجەم خانەنشینان یان میراتگرەکانیان , وە شایستەی بەخشین و ئیمتیازاتەکانیان بە گوێرەی (ماددەی (٥)-١).

جمال

**شەشەم /** تیمی تایبەت بە پلەی سەرکردەیی (قیادی) کە هیچ پەیکەرێکی کارگێڕی بەڕێوەنابەن , بۆ بەدواداچوون و چاودێری ئەو تەوەرانەی خوارەوە:-

١- سەرژمێری کردنی فەرمانبەرانی پلەی بەڕێوەبەری گشتی کە بە کردەیی هیچ فەرمانگەیەك بەڕێوەنابەن کە پەیکەری کارگێڕی یەکەی لە ئاستی بەڕێوەبەرایەتی گشتی بێت یا خانەنشین بکرێن یان بگوازرێنەوە بۆ شوێنێکی بە تاڵ (ماددەی (١٢) دووەم).

٢- سەرژمێری کردنی سەرۆکەکانی یەکە کارگێڕی یەکان کە هیچ یەکەیەکی کارگێڕی بەڕێوە نابەن , یا خانەنشین بکرێن یان بگوازرێنەوە بۆ فەرمانگەیەك کە ئەو پلەیەی بەتاڵ بێت (ماددەی (١٢)/سێ یەم).

٣- دەرکردنی پەیڕەوێك کە مەرجی دامەزراندن بۆ بەڕێوەبەری گشتی دیاری بکات (ماددەی -١٢- چوارەم).

**حەوتەم /** تیمی تایبەت بە کردنەوەی ئەژمێری تایبەت بە پێدانی مووچە و گەڕانەوەی قەرزە بازرگانیەکان بۆ بەدواداچوون و چاودێری بۆ جێ بە جێ کردنی ئەو تەوەرانەی خوارەوە:

١- کردنەوەی ئەژمێری بانکی بۆ سەرجەم سوودمەندانی وەرگرتنی مووچە (ماددەی ١٣/یەکەم).

٢- گەڕانەوەی قەرزە بازرگانیەکان و پێداچوونەوەی موڵك و ماڵ کە وەك بارمتە دانراوە (ماددەی ١٣ / سێ یەم).

**د.احمد انور محمد**

**سەرۆکی دەستە**

جمال

ناونیشان: هەولێر – شەقامی ئاراس بەرامبەری فوتابخانەی سنوبەری بنەڕەتی کچان – العنوان : اربیل- شارع اراس مقابل مدرسة صنوبر الاساسية للبنات
Email: despaky.office@gmail.com

هاوپێچی ژمارە ٣٤

**سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران**
**ژمارەی : ٤٤٩٥ لە ٢٠٢٠/٧/٢٩**

پشتبەست بە حوکمی بڕگەی (چوارەم) لە ماددەی (١٢) لە یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازاتەکان و خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٢٠، و بڕگەی (٣) لە ماددەی (هەشتەم) لە یاسای ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراو، ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی ژمارە (٣٤) لە ڕێکەوتی ١٥/ ٧ / ٢٠٢٠، ئەم پەیڕەوەی دەرکرد:

## پەیڕەوی ژمارە (٦)ی ساڵی ٢٠٢٠
## پەیڕەوی دیاریکردنی مەرجەکانی دامەزراندن لە پلەی باڵا
## لە هەرێمی کوردستان - عێراق

**ماددەی (١):**

**یەکەم:** ئەو کەسەی دادەمەزرێت لە پلەی باڵا (أ) یان (ب)ی خشتەی پەیڕەوکراوی مووچە لە هەرێمی کوردستان - عێراق، یان بەو پلانە دادەمەزرێت، یان مووچە و دەرماڵەی ئەو پلانەی بۆ خەرج دەکرێت، سەرباری هەبوونی مەرجە گشتییەکانی دامەزراندن لە وەزیفەی گشتییدا، پێویستە ئەم مەرجانەی خوارەوەی لێ بێتە دی:

أ- هەبوونی پلەی وەزیفی چۆڵ لە میلاك بۆ دامەزراندن.

ب- بەلانی کەم هەڵگری بڕوانامەی زانکۆیی بەرایی بێت، شارەزایی و لێهاتوویی لە بواری پسپۆڕیی ئەو وەزیفەیەی لێی دادەمەزرێت هەبێت، و بۆ ئەم مەبەستەش بەڵگەنامەی ڕاستێندراوی پێویست بۆ سەلماندنی هاتنەدی ئەم مەرجە پێشکەش بە لایەنی پەیوەندیدار بکات.

ج- بە تاوانی ئابڕووبەر یان جینایەت حوکم نەدرابێت و لە ماوەی خزمەتکردنیدا دەستپاکیی و لێهاتوویی سەلمێندرابێت.

د- بەشداری لەو تاوانانە نەکردبێت کە ڕژێمی بەعس نەخشەی بۆ کێشا بێت یان ئەنجامی دابێت لە عێراقدا.

**دووەم:** بۆ دامەزراندن لە وەزیفەی بەڕێوەبەری گشتی و ئەوانەی بەو پلەیەن و ئەوانەشی کە مووچە و دەرماڵەی ئەو پلەیە وەردەگرن، لە دوای بەدەستهێنانی بڕوانامەی ئاماژەپێکراو دەبێت خزمەتی لە (١٠ دە ساڵ ) کەمتر نەبێت، و (٢) دوو ساڵ لەو ماوەیە کەمدەکرێتەوە بۆ ئەوانەی بڕوانامەی ماستەر یان هاوتاکەیان بەدەستهێناوە، و (٤) چوار ساڵیش بۆ ئەوانەی بڕوانامەی دکتۆرا یان هاوتاکەیان بەدەستهێناوە، و کەمترین ماوەی خوێندن بۆ وەرگرتنی هەریەك لەو دوو بڕوانامەیە بە ماوەی ڕاژە دادەنرێت بۆ مەبەستەکانی ئەم پەیڕەوە.

**ماددەی (٢):**

**یەکەم:** خاوەن پلە باڵا بە فەرمانی هەرێمیی دادەمەزرێت دوای پاڵاوتنی لەلایەن سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان - عێراق-ەوە یان هەر لایەنێکی تایبەتمەندی دیکە بەپێی حوکمەکانی یاسا بەرکارەکان.

**دووەم:** دامەزراندن لە وەزیفەکانی بەڕێوەبەری گشتی و سەروتر لە دامەزراوە دەستوورییەکانی هەرێم ڕادەگیرێت مەگەر تەنها لەو کاتەی پلەی چۆڵ هەبێت.

**ماددەی (٣):**

حوکمەکانی ئەم پەیڕەوە پیادە ناکرێت لەسەر ئەمانەی خوارەوە:

أ- سەبارەت بەو خاوەن پلە باڵایانەی کە ڕێکار و مەرجەکانی دامەزراندنیان لە یاسا بەرکارە تایبەتەکان لە هەرێمی کوردستان - عێراق دیاری کراون.

ب- ئەوانەی ڕاسپێردراون بە خزمەتی گشتی کە لە ڕێنمایی ئاسانکاریی جێبەجێکردنی ئەم پەیڕەوە لەلایەن وەزارەتی دارایی و ئابووری-یەوە دەستنیشان دەکرێن بۆ مەبەستەکانی ئەم پەیڕەوە.

**ماددەی (٤):**

پێویستە ئەنجومەنی وەزیران و لایەنە پەیوەندیدارەکان حوکمەکانی ئەم پەیڕەوە جێبەجێ بکەن.

**ماددەی (٥):**

وەزارەتی دارایی و ئابووری ڕێنمایی پێویست بۆ ئاسانکاریی جێبەجێکردنی ئەم پەیڕەوە دەردەکات.

**ماددەی (٦):**

ئەم پەیڕەوە لە دوای تێپەڕبوونی (٣٠) سی ڕۆژ لە ڕێکەوتی بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی فەرمی (وەقایعی کوردستان) دەکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

**مەسرور بارزانی**
**سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران**

**هۆکارەکانی دەرچوواندنی ئەم پەیڕەوە**

بە مەبەستی دیاریکردنی مەرجەکانی دامەزراندنی پلە باڵاکان لە هەرێمی کوردستان - عێراق، سەرباری بوونی مەرجە گشتییەکانی دامەزراندن لە وەزیفەی گشتییدا، بە ڕەچاوکردنی بڕوانامە و پسپۆڕی و ساڵانی خزمەت و شارەزایی و لێهاتوویی، ئەم پەیڕەوە دەرچووێندرا

إقليم كوردستان ـ العراق
رئاسة مجلس الوزراء
رئاسة الديوان
دائرة الشؤون الادارية و المالية
مديرية الادارة

Kurdistan Regional Government
Council of Ministers

هەرێمی کوردستان ـ عێراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
سەرۆکایەتی دیوان
فەرمانگەی کاروباری کارگێری و دارایی
بەڕێوەبەرایەتی کارگێری

No: ژمارە: ٣٢٦٢

هاوپێچی ژمارە ٣٥

Date: ٢٠٢٠/٦/٣ ڕێکەوت: ١٣ / جۆزەردان / ٢٧٢٠ی کوردی

فەرمانگەکان ... دوادا

**بۆ / گشت وەزارەتەکان و فەرمانگە و دام و دەزگاکانی نەبەستراو بە وەزارەت**

**ب / فەرمانبەرانی پلە تایبەتی (معوم)**

کاری پێویست ئەنجام بدەن بە ناردنی ناوی فەرمانبەرانی پلە تایبەتی (معوم) بۆ ئەم سەرۆکایەتیە بە مەبەستی جێبەجێکردنی ماددەی (١٢) لە یاسای چاکسازی ژمارە (٢) ی ساڵی ٢٠٢٠.

لەگەڵ ڕێزدا،

د. ئومێد صباح عثمان
سەرۆکی دیوان

وێنەیەک بۆ:

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران
- نووسینگەی بەڕێز جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران
- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی دیوان
- سکرتاریەتی ئەنجومەنی وەزیران
- فەرمانگەی کاروباری کارگێری و دارایی.
- دۆسیەی گشتی .

بۆ ئاگاداری ، لەگەڵ ڕێزدا.

هەرێمی کوردستان - عێراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی دارایی و ئابووری
نووسینگەی وەزیر

إقليم كردستان - العراق
رئاسة مجلس الوزراء
وزارة المالية و الاقتصاد
مكتب الوزير

Kurdistan Region Presidency Council of ministers Ministry of Finance & Economy Minister Office

No:268
Date:17/6/2020

ژمارە: ٢٦٨
ڕێکەوت: ٢٠٢٠/٦/١٧

وەزارەتی دارایی
٢٧٢٠ ڕێبەندانی کوردی
نووسینگەی تایبەت

بۆ/سەرجەم وەزارەت و فەرمانگە نەبەستراوەکانی سەر بە وەزارەت (                    )

هاوپێچی ژمارە ٣٦

ب/ گشتاندن

ئاماژە بە بڕیاری لێژنەی باڵای جێبەجێ کردنی یاسای چاکسازی ژمارە (٢٩٤١) لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٤/١٦، وە ئاماژە بە پەیڕەوی جێبەجێکردنی یا سای چاکسازی ژمارە(٤)ی ساڵی ٢٠٢٠، مادەی ٣١ /١ وە پشت بە ستن بە مادەی ١٣/ بڕگەی یەکەم لە یاسای ژمارە (٢)ی ساڵی٢٠٢٠یاسای چاکسازی لە مووچە و دەرماڵە و بەخشین و ئیمتیازات و خانەنشین لە هەرێمی کوردستان - عێراق بڕیاردرا بە:

١_ کردنەوەی ئەژمێری بانکی بۆ مووچەخۆران و سودمەندان لە بوودجەی گشتی کە تاکو ئێستا ئەژمێری بانکیان نییە، بە مەبەستی وەرگرتنی مووچەی مانگانەیان.

٢_ بۆ ئەم مەبە ستە پێویستە سەرجەم وەزارەت و لایەنی پەیوەندیدار نو سراو ئارا ستەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ژمێرکاری/ جولەی دراو بکەن، بۆ جێبەجێکردن و کاری پێویست.

لەگەڵ ڕێزدا....

ئاوات جەناب نوری
وەزیری دارایی و ئابووری

**وێنەیەك بۆ:-**

- ✓ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ سەرۆکایەتی دیوان .... بۆ ئاگاداریتان/ لەگەڵ ڕێزدا....
- ✓ لێژنەی باڵا چاکسازی / سکرتاریەتی لێژنە / بۆ کاری پێویست / لەگەڵ ڕێزدا.
- ✓ فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون. بۆ ئاگاداریتان/ لەگەڵ ڕێزدا....
- ✓ بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان بۆ ئاگاداریتان.
- ✓ بەڕێوەبەرایەتی گشتی ژمێریاری/ جولەی دراو، بۆ کاری پێویست
- ✓ بەڕێوەبەرایەتی گشتی بانکە بازرگانییەکان/ لە ڕێگەی لێژنەیەک لە بەڕێوەبەرایەتییەکەتان سەردانی فەرمانگەکان بکرێت بۆ کردنەوەی ئەژمێرەکە.
- ✓ بەڕێوەبەرایەتی گشتی بانکی ناوەندی هەرێم/ سلێمانی. لە ڕێگەی لێژنەیەک لە بانکەکان سەردانی فەرمانگەکان بکرێت بۆ کردنەوەی ئەژمێرەکە.
- ✓ نووسینگە تایبەت.
- ✓ دۆسیەی سوراو

Erbil - Beside Parliament
Tel: 2230251 - 2222982 - 2231425

هەولێر - تەنیشت پەرلەمان
تەلەفۆن: ٢٢٣٠٢٥١ _ ٢٢٢٢٩٨٢ _ ٢٢٣١٤٢٥